ئەو قەیرانەی ئەمڕۆیی کۆمەڵی کوردی تێدا دەژی و لە میانەی گوتارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانی و شێوەی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی تۆلیتاریدا وەدەردەکەون و لە ژیانی مرۆڤی کوردا تەرجەمە دەبێت، لەوێدا بەشی ژن کە نیوە زیاتری ئەو کۆمەڵە پێک دەهێنێت وەرگێڕانێکی لاوازکراوە بە بەشی، بۆیە هەوڵ دەدەم لە چوارچێوەی ئایدیای فیمینیزمیدا مرۆڤەکان دابەش بکەم بەسەر دوو بەشدا:
ئەوانەی دەڵێن نیوەی پەرداخەکە پڕە بە Idealist Optimist، تاوزەد دەکرێت ئەمانە خواستی گۆڕانیان تێدا نییە.
ئەوانەی دەڵێن نیوەی پەرداخەکە بەتاڵە لە زانستی دەروونیدا پێی دەگوترێ Critics / Pessimistic ئەمانە خواستی گۆڕانیان لەسەروو ئەوهیە لە واقعدا هەیە.


Aras Press and Publisher
Kurdistan - Erbil
2005
www.araspublisher.net
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە - هەولێر


کازیوە ساڵح

فیمینستناسی و جڤاکی کوردی


تابلۆی بەرگ: رۆستەم ئاغالە
2005


# فیمینستناسی و جڤاکی کوردی





نووسینی:
**کازیوە ساڵح**

## کازێوه سالّح

# فیمینستناسی و جڤاکی کوردی

لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە و

تیۆرییەکی فیمینستیانەی گونجاوە بە ژنی کورد



ناوی کتێب: فیمینستناسی و جڤاکی کوردی
نووسینی: کازێوه سالّح
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٨٠
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
سەرپەرشتیاری چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٢٠٦)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکان و گۆڕینی زەمەن لە میانەی پێشکەوتنی ژنان بەرەو ئازادی فەراهەم دەبێت. بەرفراوانکردن و زیادکردنی پلەوپایە و بوارەکان بۆ ژنان، بنەمای گشتیی سەرجەم پێشکەوتنە کۆمەڵایەتییەکانە

ڕوجیە گارودی

## پەیڤێک

# دوا پەیڤ نییە دەربارەی فیمینزم

لەو کـاتەوەی درک بەوە کـرا کـە سـەرجـەم ئایدیا و فـەلسـەفـە و چمکە جیاوازەکان نەیانتـوانی پێناسەیەکی ڕاستەقینەی ژن ببەخشن و ڕزگاری بکەن لەو چەوسـانـدنـەوە کـۆمـەڵایەتی و سـیـاسی و ئابووری و فەرهەنگییـانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە، ژنان درکیان بەوە کرد کە پێویستە گـوتارێکی تەواو ژنانە بدۆزنەوە بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییـیەی سەرجەم چمک و فیکر و فەلسەفە جیاوازەکان نەیانتوانی پڕی بکەنەوە، ئەویشیان بەچمکی فـیمـینزمـزانی و، ئەم چمکەش لە سەدەی بیسـتـەمـدا گـەیشت بەترۆپکی گەشەکردن و دان پێدانان لەلایەن ژنانی خۆرئاواوە... تا گەیشت بەجیاوازیی فیکری لەناو فیکری فیمینزمیشدا و درز کەوتنە ناو ڕێچکە فـیکرییـەکـانیشی. درز کەوتنە ناو ژنانیـشـەوە، ئەوەش کـەرت بوونیـانی خـواست لە نێـو چمکی بەرفـراوانتـردا لەوانەش دابەشـبـوونیـان لەسـەر بۆچوونی کاپیتـالیزم، ڕادیکالیزم، سـۆشیـالیزم، ئەنارکیـزم، مـارکسیـزم، جوداخواز و تاکڕەو... هتد. کە من ئەم دابەشبوونە بەدابەشبوونێک دەزانم بەسـەر عـەقڵ ئایدۆلۆجیـا پیـاوانییـەکـاندا، یان ئایدیۆلۆجـیـیـە جیاوازەکانیش، دیسان واتای دابەشبوونی ژن دەکات نەک خڕبوونەوەیان لە دەوری گـوتارێکی ژنانە، هەر بۆیە ئەوانیش لەگەڵ ئەوەی لە سەرجەم بیر و بۆچوونەکانی تر زیاتر بۆشاییی نێوان مافەکانی ژنانی لەنێوان کۆمەڵگە و یاسادا پڕ کردەوە لە سەرەتاوە، بەڵام نەشیـانتوانی چارەسەر بن، بەڕای من بەهۆی ئەو دابەشـبـوونە و ئەو هەمـوو هەڵە و بۆچوونە نەشیـاوانە بوون بەناوی فیمینزمەوە سەریان هەڵدا و هەندێکیان ژنانی بەرەو دۆخی خراپتر و نالەبارتر برد، کە ئەگەر ئێمە لایەنە باشەکانی بگرین هەرگیز پێم وانییە فـیکری فـیمـینزم جگە لە هەڵگری هاوکێشـەی مرۆڤایەتی و مرۆڤ بوون بەشـێـوەیەکی زانسـتی هەڵگری هیچ کـام لەو بۆچوونانە بێت، هەر لەبەر



هەمان هۆ لە هەناوی ئەمانەشەوە ڕوانگەی دوو سیستمی هاتە ئاراوە، ئەم گرووپە دەیانخواست لە چوارچێوەی ئایدۆلۆجیای ڕامیاری و ئابووری بچنە دەرەوە بەرەو ڕێبازی فرەلایەنیی مرۆڤ، نەک تەنیا لە تێڕوانینی ژن یان پیاوەوە بۆ کۆمەڵ.

بەڵام گرووپی دووەم لە تیۆرییەکەیاندا سەرکەوتوو نەبوون و نەیانتوانی ئەو بەختـەوەرییـە بۆ مـرۆڤ دەسـتـەبەر بکەن کـە هەردوو ڕەگـەزی تێـدا یەکـسـانی یەک بکەن، چونکە بڵاوە پێ کردنی فیکری فـیـمـینزم لەنێـو بۆچوون و چمکەکـانی دیدا ئەو بەهایەی لێ سـەندنەوە کـە بتـوانن کـاریگەریی بنەڕەتی تەواویان بۆ سەر کۆمـەڵی ژنان هەبێت بەتایبەت کە چمک و بۆچوونەکانی تر لەنێو ئایدۆلۆجییە جیاوازەکاندا بوونیان هەبووە و زانراوە کە جێگەی هەموو ئومێدێکیان بۆ ژن تێدا نابێتەوە.

بەدرێژاییی سـەدەی ڕابردوو ئەو چمکە لە ململانێـدا بووە و کـەوتووەتە بەر تەوژمـەکـانی پەسندکـردن و ڕەتکردنەوە، بەتایبـەت لە نێـو کـۆمـەڵە ڕۆژهەڵاتییەکاندا کە بەفیکرێکی نێردراو واتە ڕۆژئاوایی ناوزەد دەکرا، لەم سۆنگەیەشەوە بەر نەفرەتی دەسەڵاتە ئاینی و کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکان کەوتبوو، بەتایبەت بەو بیـرە باوانەی کە پێیـان وایە ناهۆشیـاری باشـترە هەتا هۆشیـاری بۆ سەقامگیرکردنی خێزان، هۆشیاری ڕێژەی جیابوونەوە (تەڵاق) زیاد دەکـات. ئەمـەشـیـان لە ڕوانگەی ملکەچـوونی ژنـانەوە و تەسلیم بوونیـان بەچەوساندنەوە بەرامبەر بەچەوسێنەرەکـانیـان دەستـەبەر بوون، هەر ئەم جـۆرە ناهۆشیـارییە بەرامبـەر بەچۆنیـەتیی دەستـەبەرکردنی مـاف تەنانەت لای ژنانی ڕۆشنبیر و ناو بوارەکـانی مافی ژنانیش وای کرد کـە داواکـارانی مـافی ژن و بزووتنەوەکـانی ژنان تەمـەن و خەباتیـان خـۆی دەدات لە دوو سـەدە و و تەمـەنی بزووتنەوەی فـیـمـینزمـیش خـۆی دەدات زیاتر لە سـەدەیەک، هەتا ئێسـتـا نـاکـۆکی هەیە لەنێو ڕاڤەکـردن و بۆچوون لەسەر چۆنیـەتیی دەستەبەرکردنی یەکسانی بۆ مرۆڤەکان و دەرهاوێشتنی چەوساندنەوەکانی ژن بەهۆی فاکتەری ڕەگەزیـیەوە. هەر هەمان هۆکردار و

پەرچەکرداری لە ڕووی بزاڤە جیاوازەکاندا دروست کرد.

سەرجەم کردار و پەرچەکردار، هەژموون و ئەنتی هەژموونی بزاڤەکانی ڕابردوو و فیمینستیش بەئاشکرا دیارن و ژنانی هۆشیار دەتوانن دەستنیشانیان بکەن و ئەمڕۆ ببن بەخاوەنی دەنگ و هەژموون و بنەمایەکی هزری کە ئاستەنگەکانی ڕابردوو بەلاوە نێت و، بتوانێت پنتێک بۆ بۆچوونەکانی داڕێژێت کە کاریگەریی لەوانەی ڕابردوو زیاتر و متمانەپێکراوتر بێت، ڕاستە من ئەو فاکتەر و پنتە بەهزر و ئایدیای فیمینستی دەزانم، بەڵام دیسان پێوستە داڕشتنیشمان بۆ فیمینست بەشێوەیەک بێت کە هەڵەکانی فیمینستانی ڕابردووی تێدا دووبارە نەبێتەوە و بەرگێکی شیاوی بەڕێز و مێژووی پڕ کێشمەکێش و دووجار چەوساوەی ژنی کورد بەرجەستە بکات.

بۆچوون و ڕاڤە و لێکۆڵینەوە سەبارەت بەئایدیای فیمینزمی و ژنی فیمینزم هێندە فراوانە، کە دەیان کتێب دەستەبەری ڕاڤەی لق و بۆچوونە جیاوازەکانیان بەرهەم ناهێنن. ئەم هەوڵەی بەندە خوێندنەوەیەک و بیرێکی فیمینستانەی زیاتر تایبەت بەخۆمە و بەو شێوەی لەگەڵ چارەسەرکردنی کێشەی ژنی کورد بەشیاوی دەبینم، تەنیا ئەو لایەنانەم تێدا خستووەتەڕوو کە ژنی کورد و بزووتنەوەی فیمینستیی کوردی گەر لە داهاتوودا دامەزرا کەڵکی لێ وەربگرن و سەرجەم ئەو تەوەر و فاکتەرانەش کە بەشیاوی ژنی کورد نازانم بەر هەڵاواردنم خستووە، ئەمەی دەیخوێنیتەوە بەزمانێکی ساکار نووسراوە بۆ ئەوەی ئاستە جیاوازەکانی ژنان لێی تێ بگات، بەشێکە لەو ڕاڤانەی لە هزرمدایە لە داهاتوودا بەپێی کات و بارودۆخ بیانگەیەنم بەژنانی کورد و خوێنەرانی بەڕێز، نەوەستانیشم بۆ تەواوکردنی سەرجەم ئەو بەشانە و بڵاوکردنەوەیان بەیەکەوە بۆ ئەو هەڵانە دەگەڕێتەوە کە هەندێک کەس مۆڵەت بەخۆیان دەدەن بەناوی فیمینستەوە بیکەن، دیسان دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی هەندێ ڕووناکی لەناو کوردا کە دەیانەوێت فیمینستانە بیر بکەنەوە و بدوێن و مافەکانیان دەستەبەر کەن،



مخابن سەرچاوەیەکی دروست بەجیهانی کوردیان نییە متمانەی بخەنە سەر وەکو تیۆرییێک بۆ قسەکانیان و دووبارەنەکردنەوەی ئەو فاکتەرانەی کە لە بیر و ئایدۆلۆجیای فیمینستیدا هەیە و بەکەڵکی ژنی کورد نایەت. جا خوازیارم لە داهاتووی کوردتدا لەم بوارەدا خزمەتی زیاتر بە(ژنان، ئافرەتان و، خانمان)ی نەتەوەکەم بکەم.

## فیمینزم ئەو فریاڕەسەی پەرداخەکە پڕ دەکات

ئەو تەنگژەیەی کە ئەمڕۆ کۆمەڵی کوردی تێیدا دەژی و لە میانەی گوتارە سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیرییەکانی و شێوەی کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی تۆلیتاریدا وەدەر دەکەون و لە ژیانی مرۆڤی کوردا وەردەگیرێت، لەوێشدا بەشی ژن کە لە نیوە زیاتری ئەو کۆمەڵە پێک دەهێنێت وەرگێڕانێکی لاواز دەبێت بەبەشی و سێ فاکتەری چەوساندنەوەی ئافرەت بەهەڵە تێدا وەرگێڕدراوە ئەوانیش پیاوسالاری، جۆر و یاسایە، هەتا ئەو وەرگێڕانەش بەدروستی نەکرێت ڕاست نەکرێتەوە ژن ناگات بەڕزگاری. گەیاندنی ژنیش بەبارودۆخی دروست، گەیاندنی سەرجەم کۆمەڵ دەگەیەنێت بەبارودۆخی دروست و سروشتی. بەڵام مخابن نەک هەر ژنی کورد، بگرە ئەوەی سەبارەت بەبارودۆخ و جێگە و شوێنی ژنان و بڕوابوونیان لە سەنتەرەکانی بڕیاردان و دادگا و پەرلەمان و پۆستە گشتییەکانی دی لە جیهاندا دەیانخەینە ڕوو لە بەشەکانی داهاتوودا، بەڵگەی نەوی بوونی ژنە بۆ ئاستی بێ ئومێدی، بەڵام ژن لەبەرئەوەی وەکو کاڵایەکی پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندنەکان زۆر بەکاری دەهێنن و بانگەشەی زۆر بۆ مافەکانی دەکەن و لە لایەکی دییەوە زۆربەی وڵاتان بەکوردیشەوە زیادەڕەوی دەکەن لە بانگەشەکاندا گوایە ژنی وڵاتەی ئەوان گەیشتووە بەزۆربەی خواست و ئامانج و مافەکانیان و خەڵکانی دەوروبەری وڵاتانی تر بەپروپاگەندەی ماکیاژکراو چەواشە دەکەن، بەڵام سەیر لەوەدایە کە ژن خۆشی باوەڕی بەو چەواشەکارییە کردووە و وادەزانێت مافەکانی هەر ئەوەندەیە یا خود بەهەبوونی چەند ژنێک لە بوارە جیاوازەکاندا ئیتر توانیویەتی ئامانج بپێکێت، ئەو چەند ژنە دەتوانن پەلی ژنانی تر لە چاڵی نەهامەتییەکان ڕابکێشن بەرەو دەرەوە، بەڵام ئەوە تەنیا خەیاڵێکی بێ بەرهەمە و زۆربەی ئەوانە لە کاتێکدا توانای ژنانێکی خاوەن مەعریفە و گوتاری ژنانە ڕووی تێکردن ناتوانن خۆشیان ڕزگار بکەن، چونکە لە بنەمادا خاوەنی ئەو هێز و توانا و گوتارە ژنانیانە نین کە متمانەی مانەوەیان پێ ببەخشێت.

لەبەرئەوەی ژن لە گوتاری کوردیدا عەقڵێکی بێ بەرهەم و بوونەوەرێکی ئیستهلاکییە، تەنیا لە ڕێگەی ڕەخنەگرتن لە عەقڵەوە دەتوانێت بگات بەو ناتەواوییانەی کە لەبارەی بێدەنگی و ڕەخنە نەگرتندا نایدۆزێتەوە. ئەوەش کاتێک ژن پێی دەگات کە بگات هۆشیاریی ڕەخنەگرتن و هۆشیاریی بیرکردنەوە و بڕیاری سەربەخۆ نەک بڕیاری خوازراو و بیری خوازراو، زۆرێک لە ژنان کە باسی مافی ژن و ئازادییەکانی دەکەن یەک وشەی زادەی بیری خۆی نییە و خوازراوە لە نووسراو و بڵاوکراوەکانی دییەوە وەری گرتووە، یاخۆ دیارەکانیشمان کە قسە دەکەن دەڵێن: (من خۆم وەکو ژنێک یاخۆ ئافرەتێک لە کۆمەڵدا و...) واتە یەکێک لە بوونە بێ بەرهەمەکان کە ئەو خەریکە لێی دەردەچێت بەرەو خۆ چەسپاندن بەڵام بەقسە دیاری دەکات کە ئەو هێشتا هەر ئەو ژنەیە گوتارە کولتوورییەکە یان نەتەوایەتییەکە دەستنیشانی کردووە نەک مرۆڤایەتییەکە. بۆیە پێم وایە پێویستە ئەو سیستەم و ئایدیای باوەڕم پێی هەیە ناوم ناوە فیمینزمێکی جیاواز لەوەی لە جیهاندا هەبوو بخەینە سەر هاوکێشەیەکی زانستی دەروونی ئەو کات بەپێی ئەو هاوکێشەیە مرۆڤ بکەین بەدوو بەشەوە، بۆ ئەوەی وەڵامی پەرداخێک ئاوی نیوە بەتاڵی بدەنەوە، بۆ ئەوەی کاتێک کچێکی کورد دەبینین لە کەناڵێکی جیهانییەوە دەڵێ من لیزبینم بەناوی فیمینستییەوە ئەو حاڵەتە نەچێتە ناو کوردەوە و ببێت بەباو، هەروەها ناکرێ مرۆڤی کورد لە ئاستێکدا بژی فیکرێک کە سەدەیەک بەسەر بوونیدا تێ پەڕیوە نەتوانێت بەلایدا تێ پەڕێت بەبێ ئەوەی سڵاوی لێ بکات و بگات بەنێو کولتووری بەبێ ئەوەی ڕاڤەیەکی هەبێت بۆ لایەنەکانی، لەوانەش گرینگتر بۆ ئەوەی بۆ مرۆڤی بسەلمێنین کە ڕەخنەگرتن مایەی دروستکردن و بنیادنانی شتەکان و بەهێزکردنی تاک و کۆیە، لەوێشەوە ئەو دەرئەنجامە بکەین بەتیۆریی بەرجەستەکار و

فەراهەمهێنی ئەو چمکە زانستی و تیۆرە نوێیەی دەمانەوێت ژنی کوردی لێ بێ بەش نەبێت و بەشێوەیەکی شیاو بەئەو بخرێتە ڕوو.

ئەو دوو بەشەی مرۆڤیش بەم شێوەیە شیتەڵ دەکەین وەکو ئەوەی لە زانستی دەروونیدا هاتووە:

بەشی یەکەم: ئەو بەشەی کە دەڵێ نیوەی پەرداخەکە پڕە بە-Idealist Optimists ناوزەد دەکرێت ئەمانە خواستەکانیان پەردەی باوەڕیان نادرێت و بەوەی هەیە ڕازین و خواستی گۆڕانیان تێدا نییە.

بەشی دووەم: ئەوانەی دەڵێن نیوەی پەرداخەکە بەتاڵە لە زانستی دەروونیدا بە Critcs / Pessimistic ناوزەد دەکرێن، ئەمانە ئەو جۆرە مرۆڤانەن خواستی ئەوەوەیە کە لە ڕاستیدا لە گۆڕانیان لەسەر و سەر زەویی واقع دەیبینن، لایان وایە ئەوەی بەتاڵە پێویستە پڕ بکرێتەوە، واتە ئەوەی خراپە چاک بکرێت، ئەوەی نەشیاوە شیاو بکرێت، ئەمەش نەریتی مرۆڤی تەواوە، مرۆڤێک کە خاوەنی ئایدیای مەعریفی و نەریتی شارستانی و خواستی فیمینستی بێت چونکە لای من فیمینست دەچێتە نێو کۆمەڵەی دووەمەوە، ئەوانەی دەیانەوێ بەتاڵەکە پڕ بکەنەوە، خراپەکە چاک بکەنەوە.

ئافرەت هەتا سەرەتا شۆڕشێک لە ناخی خۆیدا نەکات ناتوانێت بگات بەحەقیقەتی شتەکان و ناوەڕۆک بەتاڵەکان، بەشی بەتاڵی پەرداخەکەی ژیانی کاتێکیش دەگات بەو شۆڕشە، دەگات بەفیکری فیمینستی ئەو فیمینستەی کە مەبەستمانە لە جیهانی کوردیدا سەر هەڵبدات و فیمینستێکی لە دەرەوەی هەڵە و نسکۆی فیمینستەکانی جیهان. چونکە ژنی کورد ئەمڕۆ لە جیهانی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیا و زانیاریدا دەژی و، گوناه دەکات ئەگەر ئەویش جارێکی تر بەنسکۆ و هەڵە و نەشیاوییەکانی فیمینستی جیهان دووبارە بکاتەوە و لە هەڵەکانی ئەوان سوود وەرنەگرێت کە ئەمی فیمینستی کوردی ڕێگەیەکی ڕاست و دروستی فیمینستانەی



نوێ بگرێتە بەر. ئەگەر فیمینزم هەڵەکانی نەبینێت، لێیان نەکۆڵێتەوە و ڕەخنەیان لێ نەگرێت ناتوانێت لە دوای ئەو چارەسەرە دروستە بگەڕێت کە پەرداخەکەی پڕ بکات و، ئەگەر پڕی کرد ڤایرۆس و خڵتەی نیوە پڕەکە شادی نەکات.

## ژنان لە هەر کوێ بن پەرداخەکەیان بەتاڵە

لەوانەیە هەندێک پێیان وابێت فیمینستەکانی جیهانی ڕۆژئاوا بێ خەوش بوون و ژنانی فیمینستی ئەوێ یان ژنانی ڕۆژئاوا بەگشتی گەیشتوون بەخواستەکانیان، لە کاتێکدا گەلێک گۆشەنیگای جیاواز هەیە دەکرێت لێوە بڕوانینە کێشەی ژنان، لەو ڕوانگەیەشەوە ئەو خەسڵەتە جیاوازەی دەدرێتە پاڵ دیاردەکانی ژنان چ بەڕووی نیگەتیڤ یان پۆزێتیڤ لە هەردوو باریشدا کەس ناگات بەلێکدانەوەیەکی قەناعەت پێهێنەر، چونکە لە بنەمادا ئامادەبوونی دیاردەکە وەکو دیاردەیەکی زەق ئامادەبوونێکی سەرەکییە، ئەو ئامادەبوونەش دەبێت بەهۆی وروژاندنی جۆرە پرسیار و ژێر پرسیار خستنێک.

لەوانەیە هەندێک پێی وابێت ژنانی ڕۆژئاوا توانیویانە بەشە بەتاڵەکەی پەرداخەکە پڕ بکەنەوە و گەیشتوون بەمافەکانیان و سووکایەتییان پێ ناکرێت، ناکوژرێن و جیاوازییان ناکرێت، نەخێر، ئەوە زانیارییەکی دروست نییە و هەتا ئێستا هیچ ئایدولۆجیایەکی گشتگیر و تاکڕەو هیچ جۆرە فیکر و فەلسەفەیەک لە کۆمۆنیستەکان، ئاینەکان، مەزهەبەکان، لیبرالی کۆن و نوێ، کۆنەخوازەکان و مەسیحییەکان، ناسیونالیستەکان بانگەشەکانی مافی مرۆڤ و جیهانی بوون و شۆڕشی زانیاریش نەیتوانیوە سەرجەم مافەکانی ژن دەستەبەر بکات و چەوساندنەوەکانی لە بنەوە ڕیشەکێش بکات. ئەوانەش پێیان وایە هەر یەک لەو ئایدۆلۆجیانە لە ڕۆژئاوادا چارەسەری کێشەی ژنی کردووە و ژنان ئازادن، ئەوە تووشی هەڵە و بگرە دەمارگرژیش بوون بەوەی هەندێ بەکارهێنانی کالاییی ژن بەئازادی

بزانێت.

چۆن بەکارهێنانی کاڵایی بەژنی ڕۆژئاوا؟!... بەو بەڵگەی ژنی ڕۆژئاوایی لە هەموو شت زیاتربوون بەکاڵای سەر سەرجەم شتە بەنرخ و بێ نرخەکان، لە فرۆشتنی گۆرەوییەکەوە هەتا جلی ژێرەوە و سەرجەم بەکارهێنراوەکانی تر ژنان بێت یان پیاوان وێنەی ژنانی ڕووتی دەخرێتە سەر و بۆ سەرنج ڕاکێشانی کڕیار و فرۆشتنی شمەکەکان، بەدەیان نەشتەرگەریی جوانی دەکەن بۆ ئەوەی کاڵایەکی سەرنجڕاکێش بن لەسەر ڕووی ڤیدیۆ و فۆتۆگراف و کەناڵە سێکسییەکان، وەکو ئامێرێکی سێکسی باندی بازرگانی گەورە بەڕێوەیان بەرێت و هاوردە و بردە (استراد و تصدیر) دەکرێن لەنێو وڵاتە جیاوازەکاندا، ئەوەش بەیاسای کۆمەڵی مەدەنی پەردەپۆش دەکرێت و زۆرجار مۆڵەتی یاسایش لە حکوومەتە جیاوازەکانەوە وەردەگرن، چونکە لێرەدا حکوومەتیش سوود لە تاکسەکەیان وەردەگرێت، کۆمەڵێکی زۆری ژنان هۆشیارییان نەگەیشتووە بەوەی کە جیاوازیی نێوان کاڵابوون و مرۆڤبوونی خۆیان بکەن، چونکە لە بنەمادا وڵاتانی سەرمایەداری سەرجەم چمکە فەلسەفی و مۆراڵییەکان لە بۆتەی سەرمایەدا تواندووەتەوە مرۆڤ تەنیا وەکو کاڵا سەیر دەکەن، هەندێ جار ئابووریی نالەبار و ژیانی سەختی ژنان پاڵی پێوە دەنێت ئەو کاڵابوونەی لا پەسند بێت ئەگەر هۆشیاریشی مرۆڤایەتی و کاڵابوون لێک جودا بکاتەوە.

ژنی کورد تەنیا بەدارشتنی یاسای یەکسانیخواز ڕزگاری نابێت، وڵاتانی ڕۆژئاوا لەمێژە سەرجەم یاساکانیان خستووەتە خزمەت ژنان و زۆر تایبەتمەندی و بژێوییان بۆ ژن دابین کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نە یاسا و نە هاوکارییە ئابوورییەکان نەیتوانییوە ژن لە کاڵابوون، ژن لە کوشتن، ژن لە ئیغتیساب کردن ڕزگار بکات.

ڕۆژانە لە دادگاکانی ڕۆژئاوادا کێشەی ژنی کوژراو هەیە بەدەستی مێردەکەی و یان دۆستەکەی، تەنیا لە یەک خاڵدا ئەو کوشتنانە جیاوازی هەیە لەگەڵ کوشتنەکانی کوردستاندا، ئەویش ئەوەیە لە کوردستاندا ژن



بەبێ تاوان بەتاوانی شەرەف دەکوژرێت لە ڕۆژئاوادا ژن بەبێ تاوان دەبێت بەقوربانی هاوڕێ و هاوسەرە تلیاک کێشەکەی، یاخۆ داوای پارە پەیداکردن و خۆفرۆشی لە ژنەکەی یا هاوڕێ کچەکەی کردووە... هتد. (ئەو نەخۆشییانەی ڕۆژئاوا بەپێی ڕۆژنامەکان بەو دواییە گەیشتوونەتە کوردستانیش). ئازادییەکانی ئەوروپا چونکە بەناهۆشیاری و بەر لە هوشیاربوونەوە بەژن بەخشرا و پاڵنەرەکانی شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم، کۆمپانیا بازرگانییەکان هۆکاری سەرەکی بوون، بەلێشاو ژنانی لە کونجی ماڵەوە گواستەوە بۆ تیاترۆکان و سێکس فرۆشی ڕەسمییەوە. لە پەروەردەکردنی منداڵەوەی گواستەوە بۆ پەروەردەکردن و پارە پەیداکردنیش بۆ بژێوی پەروەردەکردنی منداڵەکە، گواستیەوە بۆ ڕێژەیەکی زۆری هەبوونی منداڵی نامەشروع و پەروەردەکردنی منداڵی بێ باوک. لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتن و خواستانەی کە ژنانی ڕۆژئاوا پێی گەیشتوون بەڵام کەموکوڕییەکان و نیگەتیڤەکان زیاترن لە پۆزەتیڤەکان و ژنی کورد کێشەی ئەوەی هەیە منداڵەکەی هیچ سیفەتێکی ئەو وەرناگرێت و بەناوی ئەوەوە ناونووس ناکرێت، ژنی ڕۆژئاوا کێشەی ئەوەی هەیە منداڵەکەی بەناوی کێوە ناونووس بکرێت و لە کوێ باوکە نادیارەکەی بۆ بدۆزرێتەوە هەتا دەگاتە سەرجەم کێشەکانی دیش.

بۆیە ئێمە پێمان وایە ژن نەتەنیا بەیاسای داسەپاو نە بەیەکسانییەکانی پیشە و سیاسەت و دام و دەزگاکانی تر ناگات، بەمافەکانی ناگات بەو ئامانجەی کە ئێمەی ئافرەت خەونی پێوە دەبینین هەتا شۆڕشی هوشیارکردنەوەی ژن و کۆمەڵ ڕوو نەدات. دیارە هوشیاریی ژنیش بەهۆشیاریی کۆمەڵەوە بەندە، بەڵام کاتێک سەرجەم ئاراستە سیاسییەکان پێچەوانەی ئەو مەبەستەی بێت ژن پێویستە لەناو خۆیدا خۆی ڕێک بخات و هەنگاو بنێت بەرەو هۆشیاری. بەر لە هۆشیاربوونەوەی ژن و یەکگرتنی لەژێر دروشمی ژنانە و دەرچوونی لەژێر چەتری حزب و لایەنە شۆڤێنی و بەرژەوەندخوازەکان ناتوانێت بگات بەهۆشیاری.

ژنی کورد تەنیا بەئایدیۆلۆجیایەکی گشتگیر کە لە دەوری ڕەگەزەکەی خۆیدا کۆبێتەوە و خوێندنەوەی دروست و زانستیی هەبێت بۆ کێشەکان دەتوانێت بگات بەچارسەرێک کە خۆی لەو مەینەتی و بەشخوراووییە ڕزگار بکات، لە لایەکی تر هەڵەکان و بانگەشە بریقەدارەکانی ڕۆژئاوا نەیخەڵەتێنێ تا هەڵەکانی ئەوان دووبارە کاتەوە. ژنی کورد پێوستە لە هەڵەکانی ئەوان و دەوربەر سوود وەربگرێت و ئەمڕۆی جیهانی تەکنۆلۆجی ڕاست و هەڵەکانی سەرجەم مرۆڤایەتی لە توێی دەفتەرێکی بچووکدا یاخۆ لە چوارچێوەی گوندێکی بچووکدا خستووەتە ڕوو کە ناوی ئەنترنێتە. لەوێوە ژن دەتوانێت سوود لە خاڵە بەهێز و لاوازەکان وەرگرێت و نەهێڵێت هەڵەکانی مافی ژنانیش وەکو هەڵە سیاسییەکانمان دووبارە ببنەوە، یان لایەنی کەم هەندە زۆر و زەق نەبێت کە چارەسەرکردنی وەکو ئێستای ڕۆژئاوا تاریک بێت و خۆیان لە پێوەندییە بێ دیسپلینەکانی نێوان خۆیان بپارێزن.

# بەشی یەکەم

بەرایی

فیمینزم چییە ؟

فیمینست کێیە ؟

سەرهەڵدانی بیری فیمینزم

سەرهەڵدانی فیمینزم لەناو عەرەبدا

فیمینستی کورد

ئایا خەباتی ژنی کورد فیمینستییە ؟

ئایا ڕێکخراوەکانی ژنی کورد فیمینستین ؟

فیمینزم و ئەنتی فیمینزم

فیمینزم یا ڕەیسیزم

## بەرایی

مێژووی مرۆڤایەتی دابەشکراو نییە بەسەر یەک پنت و ڕەنگ و هارمۆونیەت و خواست و شێوە و گۆزەراندا، مرۆڤ ئافریدەیەکی ئارەزوومەندە و هەمیشە ئارەزووی گۆڕانەکان مرۆڤی تووشی دڵەڕاوکێ و هەندێ جاریش شۆک کردووە، ناکۆکیی لەگەڵ چمک و دەستەواژە و دیاردە نوێیەکاندا ناوەتەوە و زۆرجاریش مرۆڤی شەرمەزاری نیگا و دەرگا کراوەکانی مێژوو کردوە.

لە سەدەکانی ڕابردوودا و بەسەرهەڵدانی پرۆژەی ڕێنسانس بەتایبەت لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا و لەو کاتەوەی پرۆژەی ڕۆشنگەری کەوتە بەرباس و لێکۆڵینەوەی بیریاران و زانایان و، بوو بەفاکتەرێکی کارای کاریگەر و کارلێکەر لەسەر دۆخی مرۆڤایەتی و ژیانی تاک، تیژڕەوانە سنووری ناوچە و وڵاتی تێ پەڕاند و بەسەر سەرجەم زەمیندا و کاریگەری پۆزەتیڤ و نەگەتیڤی خۆی لەسەر تاک بەجێ هێشتووە، هەر بۆیە لەو سەردەمانەوە هەتا ئێستا هەر لە نێوان چەند ساڵێکدا چەندین چمک و دەستەواژەی نوێ دێتە کایەوە کە سەرجەمیان ئەگەر بەشیتەڵکردنی ڕاستەقینە بگەڕێینەوە بۆی، بنجیان لەسەر مۆدێرنە داکوتاوە، ئەو چمکانەش کە زیاتر کاریگەرییان بەجێ هێشتووە و زۆرتر قسەیان لەسەر کراوە، هەندێ جار لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییە پۆزەتیڤەی بۆ مرۆڤی هێناوە شەڕ و ئاژاوە و ململانێش لەناو گرووپە جیاوازەکانی کۆمەڵ و جیهانیشدا دروست کردووە، ئەوەش بۆ خۆی خوێندنەوەی زۆر دەدات بەدەستەواژەکە و ئەو مشتومڕەش هۆی ڕاستەقینەی گۆڕانکارییەکانن.

زۆرجاریش چمکەکە لە واتادا یەک بەها و مانای هەیە و ئەو گۆڕانەی وەکو چمکەکانی (ڕۆشنگەری، مۆدێرنە، نوێگەری، فیمینزم و مافی مرۆڤ، سەلەفیەت و کۆمەڵی مەدەنی و بەجیهانی بوون، ئیسلامی سیاسی، ئیرهاب و تاد...) دیارە لە یەکچوون و لە یەک نەچوون، دژ و تەبا



لەنێوان ئەم وشانەدا هەیە و لە هەمان کاتیشدا زۆر جاران هەندێ لە نووسەر و ڕۆشنبیران پڕ دەدەنە ئەو چمکانە تەنیا بۆ ئەوەی پێی بڵێن کەسێکی مۆدێرنە و یان مرۆڤی سەردەمەکەی خۆیەتی و یان لە گۆڕانکارییەکانی جیهان تێ دەگات و ڕۆشنبیرە و دەنا وەکو کاریگەری و بەها و گۆڕانکارییەکان و چمکەکان و سەردەمەکەی سەربار ناکات، بگرە کاریگەریی نەگەتیڤیشی هەبێت بەڕادەیەک چمکەکە واتای ڕاستەقینەی خۆی لەدەست دەدات و چەندین واتای نەیاری بۆ دێتە گۆڕێ هەر یەک لەو چمکانەش کۆڵەکەیەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییە و ئەستەمە لە یەک جیا بکرێنەوە و بەدەربڕینێک ناوزەدیان بکەین، هەر بۆیەش توانرا فیمینزم بەچەندین ستایلی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی لێ کەوێتەوە و ببێت بەجێگەی مشتومڕی زۆر. لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین بچینە سەر چەند چمکێک لەو چمکانە بزانین تا چەند لەو خوێندنەوە فیمینزمییەوە نزیکە کە ئێمە بۆ ژنی کوردی دەخوازین.

### فیمینزم چییە؟

فیمینزم (Feminism) ئەو ناوناتۆریەە نییە کە هێزە دژەکانی ژن داویانەتە پاڵ وشەکە و لە ئەرک و کارە پڕ واتای چمکەکە کەم دەکرێتەوە، فیمینزم واتە زانستی ژنناسی واتە ئەو میکانیزم و فاکتەرەیە کە بەشێوەیەکی زانستی خەبات دەکات بەئامانجی بەرامبەری مافەکانی ژن، وشەی فیمینزم (Feminism) وشەیەکی لاتینیە و لە وشەی فیمینا (Feminia)ەوە هاتووە کە بەواتای ئافرەتە، کەواتە جەندەری (Female)یش هەر لەو وشەیەوە هاتووە کە ماناکەی (مێ) دەکات واتە لە بنەمادا دەکرێ وشەکەs Female' لە فیمیلیزم (femalesm) هاتبێت، پێم وایە لە lideration Fema le Movment هاتووە، بەڵام هەندێکی تر پێیان لە چمکی (Women libertation Movment)ەوە هاتووە، کە ئەمەشیان هەر ڕاستە و سەرجەم بۆچوونەکان واتای خڕبوونەوە لە دەوری مێ لەخۆ دەگرن، کە

ڕزگارکردنی ژن و بەرگری لە مافەکانی دەگەیەنێت(*)، بەرگریش دروست نابێت بەبێ هێز و هێزیش نایەتە ئاکام بێ پرسی سەردەم، کەواتە فیمینزم لە پرسیاری سەردەمەکان بەرامبەر بەمافەکانی ژن و هەوڵدان بۆ گەیاندنی ئەو پرسیارانە بۆ ئاستێکی باڵا بۆ ئەوەی کاریگەری لەسەر گوێی کاسی ئەو مرۆڤ و فاکتەر و پنتانە هەبێت کە نایانەوێ گوێیان لەو پرسیارە چارەنووسسازە بێت، فیمینزم ئەو پنتە ستەم لێ کراوەیە کە لە چوارچێوەی گرووپێکدا خۆی ڕێک خستووە بۆ چوارچێوەی وشەیەکی زانستی بۆ گەیاندنی خواست و مافی ژن لە کەنارەوە بۆ سەنتەر واتە سەنترالیزمی ژن لە ژیاندا.

## فیمینست کێیە؟

فیمینست مرۆڤی ژنناسە، مرۆڤی مرۆڤدۆستە. ئەو مرۆڤەیە دەزانێت کەوا پێویستیی بەپەیمانی کۆمەڵایەتیی نوێ هەیە، لە چوارچێوەیەکی مەعریفییانە، ئاشتیخوازانە و مرۆڤانە بۆ پێناسەکان دەگەڕێت، ئەو مرۆڤەیە دەزانێت ژن هەتا پێناسەی خۆی دیاری نەکات ناتوانێت پێناسەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری بۆ کەسانی تر نیشان بکات و هەوڵی فەراهەم هێنانی بدات. پێناسە نیشانکردنیش لە ناسینی خودەوە سەرچاوە دەگرێت وەکو ئەوەی مرۆڤێک چۆن خودی خۆی دەناسێ؟! و چۆن خودی خۆی دەناسێنێت؟! پاش هەر دوو تەوەری ناسین چۆن گوزارشت لەو ناسنامەیە دەکات؟.

هەموو مرۆڤێک بەڕەهایی (من)ی بۆ خودی خۆی و (ئەو)ی بۆ ئەوی تر زەند کردووە، هەروەها بۆ هەموو کۆمەڵ و گەل و نەتەوەیەکیش هەر وایە هەتا (من) بەرجەستە نەبێت (ئەو)یش نادیارە، هەتا شوناسی (من) نەدۆزێتەوە ناتوانێت ڕێزی (ئەو)یش بگرێت و خۆت پابەندی بەدیهێنان و پاراستنی پێناسە بکەیت. بۆیە فیمینست پێی وایە پێویستە سەرەتا سەرقاڵی دروستکردنی پێناسەی (من) بێت ئەوجا داوای دروستکردنی



پێناسەی (ئەو)یش بکەیت.

فیمینست ئەو مرۆڤەیە درک بەوە دەکات کە هەروەکو چۆن وڵاتە زلهێزەکان باوەڕ بەسەروەریی وڵاتە لە خۆیان کەم هێزترەکان ناکەن و کەی بیانەوێت سەروەرییان زەوت دەکەن، بەو شێوەیە سەروەریی پیاو کە سەرخراوە بەسەر سەروەریی ژندا، پیاوان دەستبەرداری ئەو سەروەرییە یوتوپییایەی خۆیان نابن و بەبێ هەبوونی ئەو فاکتەرانەی کە هێزی فیکری و سەروەری زەوتکراو و گوتاری ژنانە فراوان دەکات بەسەر گوتاری سەروەری زەوتکەر و گوتاری پاتریارکی و فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانی تر کە نەوی لە مرۆڤەوە پێشنیار کردووە بۆ کویلە.

## سەرهەڵدانی فیمینزم

سەرهەڵدانی پرۆسەی فیمینزم وەکو واتا و کاری ژن دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی بیستەم، بەڵام دەرکەوتنی کاری ژنانە و ڕێکخراوەیی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییی سەدەی ناوەڕاست و سەرهەڵدانی کاپیتالیزم و زیادبوونی خواست و ئاواتەکانی مرۆڤ و، جۆشدانی هەستی وەدیهێنانی لای مرۆڤ، لەوێوە ژیانی ژنیش گۆڕانکاریی بەسەردا هات و توانیی هەنگاوێک بنێت بەرەو خواستەکانی... لە ڕۆژگاری شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکادا لە ساڵی (١٧٧٥-١٧٨٣) بۆ یەکەمجار ژن درکی بەوە کرد کە مافی سیاسی و ئابووری و پیشەییی هەیە و داوای مافی هەڵبژاردنی کرد و ڕووبەڕووی دەسەڵاتە تولیتارییەکانی ئەو سەردەمە بووەوە... ئەو ئامانج و خواستەی ژنی ئەمریکی کاریگەریی خۆ گەیاند بەژنانی فەرەنسا و لەو وڵاتەدا ٨ هەزار ژنی کرێکار و سەوزەفرۆش لە ساڵی ١٧٨٩دا هێرشیان کردە سەر کۆشکی ڤێرسای بۆ وەدەستهێنانی مافەکانی خۆیان لە نان و ئازادیدا. کەواتە لێرەدا هەست بەپێویستیی هەبوونی گرووپی فیمینستی کراوە، ئەگەر وەکو چمکیش ناوی نەنرابێت فیمینست. چونکە یەک دەنگی و یەک ئامانجی هەمان واتا دەگەیەنێت.

له ساڵی **١٧٩٢** له لەندەن بۆ یەکەمجار کتێبی بەرگری له مافی ژنان له لایەن ژنه نووسەر (ماری ولستونکرافت)ەوه بڵاوکرایەوه که زۆر بەتوندی بەرگری له ژن و مافەکانی دەکات... ئیتر لەو سەدەیەدا ژن نەیتوانی بگات بەخواستی زیاتر و هەر زوو ئەو هەوڵانەی لەناو برا که پێشتر بۆ مافی سیاسی و نان و ئازادی لەبواری بیرمەندیدا دابووی و له ساڵی **١٧٩٣**دا سەران و دەسەڵاتدارانی فەرەنسا لەو هەنده ئازادییه پاشگەزبوونەوه و بڕیاری داخستنی سەرجەم سەندیکا و ڕێکخراوەکانی ژنان درا و هەر لەو ساڵەدا بوو مەدام ڕۆلان (خاوەنی وتەی: ئەی ئازادی چەند تاوان بەناوتەوه دەکرێت) که ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو له بڵاوکردنەوەی بیری سەربەستی و خاوەنی دیوەخانێک بوو بۆ کۆبوونەوەی ژنان و کەسانی پێشکەوتووخواز و لەوێوه له واتای سەربەستی خەباتکردن تێگەیشتن و بەو بیانوەی سەرپێچیی له یاساکانی پاشگەزبوونەوەی سەرانی فەرەنسای کردووه و بەرگریی له بیروباوەڕی خۆی کردووه، سەری بەخشی بەسەربەستی و بەدەستی دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاته سەری قرتێنرا، چیدی ژن نەیتوانی خاوەنی هیچ پەیڕەو و پرۆگرام و تایبەتمەندییەکی خۆی بێت هەتا ساڵی **١٨٤٨** و شۆڕشی گەورەی ئەورووپا له کاتی ئەو شۆڕشەدا ژنانی فەرەنسا جارێکی تر بەباڵای خەباتی خۆیاندا هەڵچوونەوه و چەند یانه و سەندیکای ژنانیان دامەزراند که داوای یەکسان بوونیان دەکرد له ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە.

له ساڵی **١٨٦٧**یشدا له بەریتانیا ئافرەتانی ئەو وڵاته داوای مافی هەڵبژاردنیان کرد و له **١٨٦٩**شدا ژنانی ئەمریکا له نیویۆرک ڕێکخراوی سەربەخۆییی ژنانیان دامەزراند و ئیتر لێرەوه هەتا ساڵی **١٨٨٨** بوو بەڕۆژی هەڵهاتووی ژن و له زۆربەی وڵاتانی جیهاندا ڕێکخراو و سەندیکای ژنان دامەزرا، ئەو بەربڵاوییەش هانی ژنانی ئەمریکای دا که پێش هاوڕەگەزەکانیان کەوتبوون لەو ڕووەوه (ئەنجوومەنی وڵاته یەکگرتووەکانی ئەمریکا) و بەدواشیدا (یەکێتی ژنانی جیهان)



دابمەزرێنن[١].

ئەو بارودۆخه لەنێوان ڕەتکردنەوه و پەسندکردندا مایەوه هەتا دەرکەوتنی بیری سۆشیالیزم، بەدەرکەوتنی بیری ڕۆشنی سوشیالیستەکان له ساڵی **١٨٩١**دا ژنانی کرێکار له زۆربەی وڵاتانی جیهاندا ڕێکخراوی تایبەت بەخۆیان دامەزراند و هەر ئەو خەبات و ساردنەبوونەوه تێکۆشانه بەردەوامه بوو که هەتا ساڵی **١٩١٠** هەنگاوی گەورەیان بەرەو ماف و تایبەتمەندییەکانی خۆیان نابوو و ساڵانه کۆنگرەیان دەبەست و ژنانی زۆرینەی وڵاتەکان بەشدارییان تێدا دەکرد، له دووەم کۆنگرەی ئافرەتانی جیهاندا و له ساڵی **١٩١٠** له کۆپنهاگنی پایتەختی دانیمارک بەسترا و لەو کۆنگرەیەدا لەلایەن (کلارا زتکین)ەوه پێشنیازی ڕۆژی ٨ی مارس کرا و لەو کۆنگرەیەدا بڕیاری لەسەر درا.

٨ی مارس ئەو نەریتە بوو که ژنانی جیهان زۆریان سوود لێ بینی و ئەمه بەهەنگاوێکی تەواو فیمینستانه ناودەنرێت، چونکه یەکەم بۆنه بوو که تەنیا ژنی تێدا کۆ ببێتەوه و تەنیا بەناوی ژنەوه بێت جگه له ئاگاداربوونەوەی هەواڵێک لەو کاتەدا ٨ی مارس پردی بەیەکگەیشتنی ژنان بوو بۆ گۆڕینەوەی بیروبۆچوون و یەکگرتنی هەوڵەکانیان بەمەبەستی گەیشتن بەئامانجەکانیان و بەڵام[٢] بەسەرهاتی شەڕی یەکەمی جیهانی کۆسپی زۆری هێنایه ڕێگەی بزووتنەوەی ئافرەتان و لەگەڵ تەواوبوونی ئەو شەڕەدا تێ هەڵچوونەوه، ژمارەیەک ڕێکخراوی تری ئافرەتان دروست بوو، وەک یەکێتیی فیدراڵی ئافرەتانی زانکۆیەکانی جیهان له ساڵی **١٩١٩** دامەزرا. هەروەها ڕێکخراوی ئومەمییەت بۆ ئازادیی ئابووریی کرێکاری له **١٩٢٩** دامەزرا، دامەزراندنی یەکێتی ئەو ئافرەتانەی بەکاری سەربەستەوه خەریکن ساڵی **١٩٣٠**.

ئیتر له سەرەتای سەدەی بیستیشەوه بزووتنەوەی فیمینستی بەهێزێکی جیاوازەوه له ڕووی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاساییەوه دەرکەوت و هەر ئەو هێزه جیاوازەی فیمینست بوو دابەشی کردن بەسەر

فیمینستی لیبرال، ڕادیکال، مارکسی، ئیسلامی و... هتد. خستنیە پەراوێزی چمکە سیاسییەکانەوە کە لەو کاتەدا دەرکەوتن، بەپێی ناوی ئایدۆلۆجیا و گرووپە سیاسییە جیاوازەکان ئایدۆلۆجیای فیمینستیش دابەش کرا و ئیتر لەوێوە واتا ڕاستەقینەکەی خۆی دۆڕاند و بوو بەپاشکۆی عەقڵ و بۆچوونە جیاوازەکان نەک بزووتنەوەی ژنناسی یان فیمینست. واتە ژنانی فیمینست دەستیان کرد بەکاری سیاسی و بانگەشەی گرووپە جیاوازەکان و نوێنەرایەتیکردنی گرووپی ژنانی ئایدۆلۆجییە سیاسییەکان.

## فیمینزمی ئەدەبی

سەرەتای سەرهەڵدانی فیمینزمی ئەدەبی دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی ژانرە ئەدەبییەکان لە لای ژن و سەرهەڵدانی کۆمەڵێ ژنی بیریار و نووسەر و بەتوانای بواری ئەدەبی ڕۆژئاوایی، ئەو کات بایەخ بەبەرهەمی عەقل و بیری ژن نەدەدرا و بایەخ بە وتە و بۆچوون و دیدارەکانیان نەدەدرا و لێرەوە کۆمەڵێ ژن کە سەرەتا بەخەمی ئەدەبی دەستیان کرد بەبەرگری لە مافەکانی خۆیان و بەرگری کردن لەیەک و، بیروبۆچوون و دیدارەکانیان بەو شێوەیە بوون بەکۆڵەکەیەکی بەهێزی ڕەوتی فیمینزمی، دەستپێکی ئەو ڕەوتەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم و دیارترین دەرکەوتووی ئەو بوارە سیمۆن دی بوڤوارە کە لە ساڵی ١٩٠٨دا لەدایک بووە و لە سەرەتای دەرکەوتنی سیمون دی بوڤواردا هاوبیرەکانی وەکو (ئەدیت وارتن، فرجینا ولف، کترین مانسفیلد، ئەیرەس مەردوخ، ڕەبیکا ویست، جولیا کریستیانا، ئنجیلا کارتەر، بۆتلیر، کەتی ڕۆیڤ، تالیم سیسکو، ڕۆسی، دایانا فۆس) و هەندێکی تر بوون بەبەردی بناغەی ئەو تەوژمە ئەدەبییە بەهێزەی سەدەی بیست لە سەرجەم ئەوروپا و ئەمریکا و فەرەنسادا.

بەپێی بۆچوونەکانی ژنە ڕەخنەگری ئینگلیز (لۆرانا سادج) خوێندەوەی بۆ ژنە نووسەرە دەرکەوتووەکانی سەدەی بیست، بەڕێوەبەران و دەرکەوتوانی ڕەوتی فیمینزم زیاتر بە سیمون دی بوڤوار و فرجینا ولف و کاترین



مانسفیلد و ئەیرس مەردوگ و ئنجیلا کارتەر دەزانێت.

ئەو ژنانە بەو مەبەستە ڕوویان لە ژانری ئەدەبی کرد، پەنایان بۆ ئەو بوارە برد بۆ دەرکەوتن لەبواری ئەو ئەدەبە نەریتییەدا نەبوو، کە پڕ بوو لە نەریت و هاوکێشە و ئاماژەی پیاوسالارانە، ئەوان توانییان گێڕانەوە (السرد)ی چیرۆک بقۆزنەوە بۆ گێڕانەوەی خود و لە گێڕانەوەی خودەوە گێڕانەوەی چەوساندنەوە و گۆشەگیری و پەراوێزیی ژن بخەنە ڕوو و، زۆربەی ئەو نووسەرانەش بوون بەپێشەنگی ئەو بزووتنەوە ئەدەبی و فیمینزمییە کە هەردوو بزووتنەوەکەیان بەڕێوە دەبرد و، دەتوانین ناویان بنێین (ئەدفیزم)، ئەوان کە دژی هەردوو ڕەوتی ڕیالیزم و سروشت بوون بۆ پۆلینی ئەدەبی، کە لەو سەردەمەدا ئەو پۆلین کردنە دەستی بەسەر ئەو ناوەندەدا کێشابوو، خۆ ژنێکی وەکو سیمون دی بوڤوار تەنانەت نووسینە فیکرییە نا ئەدەبییەکانیشی وەکو کتێبی (ڕەگەزەکەی تر) بەهەمو شێوەیەک لە پۆلینی شێواز و ئەبستراکت دوور کەوتووەتەوە و زۆر بایەخی بەناوەڕۆک و بابەت داوە و بۆڤوار یەکێک بوو لەوانەی دوژمنایەتیی ئەدەب و هونەری ئەبستراکتی دەکرد و، تەنانەت دژایەتیی ئەدەبیشی دەکرد ئەگەر ئەو ئەدەبە نەکەوتایەتە پەراوێزیی کەسایەتیی ژنەوە، ئەو دژایەتییەش لە هۆشیاریی بەرامبەر بەپێویستی پێناسەی ژنەوە سەرچاوەی گرتبوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هاتە ئاراوە، هەتا ئێستا بەشێوە و جەمسەری جۆراوجۆردا تێ پەڕیوە و گۆڕانکاریی بابەتی و تیۆریی بەسەردا هاتووە. واتە ئەو کۆمەڵە ژنە نووسەرە ئەرکی ئەدەبیان لە ژانرێکی شکلییەوە گواستەوە بۆ ژانری چاودێریی خود و لەوێشەوە بۆ چاودێریی گشتی و بوون بەگەواهیدەری ژانری چاودێریی خود و لەوێشەوە بۆ چاودێریی گشتی و بوون بەگەواهیدەری ژیان و ئەرک و ماف و ئازارەکانی ژنانی سەردەمەکەی خۆیان و لە ڕێگای گێڕانەوەی ئەدەبییەوە، ئەوەش یەکێک بوو لەو سیمایانەی کە ژنە نووسەرەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمی پێ ناسراوە، هەروەها کاریگەریی گەورەیان لەسەر بەجێ هێشت

که هەمان ڕێبازی ئەوان بگرن، هەر ئەو شۆڕشە ئەدەبییانەش بوون شۆڕشی فیمینستییان بەتیۆریی نوێ لە ناخی ژندا چاند و پاشان هەلومەرجی گەلاڵەبوون و پراکتیزەکردنی تەواویان بۆ خوولقاند لە تاکەوە بۆ گرووپ و لە گرووپەوە بۆ کۆمەڵ.

## سەرهەڵدانی فیمینست لەناو عەرەبدا

سەرەتای سەرهەڵدانی باسکردن لە مافی ژن و ڕێکخراوی ژنان لەناو عەرەبدا لە میسر سەری هەڵداوە و وەکو فیکر و تیۆری دەگەڕێتەوە بۆ کۆتاییی سەدەی هەژدە و بەپراکتیزیش بۆ سەرەتای سەدەی نۆزدە، بەتایبەت لە ساڵی ١٨١٣ەوە ئەو کاتەی ڕیفاعە ئەلتەهتەهاوی لە پاریس گەڕایەوە بۆ میسر بەکۆمەڵێ ئایدیا و بیروباوەڕی نوێوە بۆ ژنی میسر و عەرەب، بەپێی لێکۆڵینەوە و بۆچوونەکانی خۆیان سەرهەڵدانی ئەو بزووتنەوەیە لەناو خۆیاندا تەنیا ناگەڕێننەوە بۆ عەقڵی ڕۆژئاوا بگرە دەگەڕێننەوە بۆ هاوکاریی ڕۆژئاواش، سەرجەم گۆڕانکارییەکانی ژیانی ژنیش لە سەدەی نۆزدە و بیستدا دەگەڕێننەوە بۆ پلانی ڕۆژئاوا دژ بەکولتوور و نەریت و ئاینی عەرەب، هەڵگەڕانەوەی تاکەکان لە نەریت و کولتووری باوەڕ پێکراوی ئەوان، بۆ ئەو مەبەستەش کتێبی نووسەری فەرەنسی (ئەلکۆنت دارکور) کە لە ساڵی ١٨٩٤ بەچاپ گەیەنراوە، دەکەن بەبەڵگە کە نووسەر لەو کتێبەدا بەرگری لە ژنی عەرەب دەکات و هێرش دەباتە سەر حیجابی ئیسلامی و بێ مافی ژنی میسر و چواندنی بێ دەنگی ڕۆشنبیران و نووسەران بەرامبەر ئەو دیاردەیە بەتاوانێکی گەورە و نکۆڵی لێکراو.

هەر لەو ڕوانگەیەشەوە بوو کە لە ساڵی ١٨٩٩ یەکەم داکۆکیکاری ژنی عەرەب نووسەری بەناوبانگ (قاسم ئەمین) کتێبی (تحرير المرأة)ی بەچاپ گەیاند، هێرشێکی توندی کرایە سەر گوایە بەپشتگیریی ڕۆژئاوا و سەعد زەغلوول و شێخ محەمەد عەبدە و هەندێ ڕەمزی سیاسیی تری ئەو



سەردەمە کە بەرگریان لە بیری پێشکەوتووخواز و ژن دەکرد دەژمارد، چونکە قاسم ئەمینیش هەمان بۆچوون و پێشنیازەکانی (دارکور)ی خستبووە ڕوو، کتێبەکەی قاسم ئەمین لەو سەردەمەدا گەورەترین ململانێ و مشتومڕی خوڵقاند، هەر بەهۆی ئەو گومانەشەوە بوو لای خۆیان وایان تۆمار کرد کە داواکردنی مافی ژن لەناو عەرەبدا بەهاوکاریی ڕۆژئاوا کراوە، هەر واش بوو زۆر لە چالاکییەکانی ژن لە میسردا بەهاوکاری و پشتگیریی باڵیۆزی ئەمریکی و ئینگلیز کراوە لە میسردا، لەبەرئەوەش بوو کاتێک (مرقي فهمي المحامي) کتێبی (المرأه فى الشرق) چاپ کرد و ئەویش داوای لابردنی حیجاب و قەدەغەکردنی فرەژنی و حەلاڵکردنی هاوسەرێتیی لە نێوان موسڵمان و مەسیحیدا دەکات ئەو مشتومڕە توندەی نەخوڵقاند و، نەکەوتە بەر کوتەکی ڕەخنەی میسرییەکان و عەرەب وەکو قاسم ئەمین.

باسی تیۆری و فیکریی ماف و یەکسانی بۆ ئافرەتانی عەرەب دەتوانرێت لە سەرەتادا وەکو چوار قۆناغ سەیری بکرێت کە لە قۆناغی چوارەمدا ژنی عەرەب خۆی هاتووەتە بوارەکە و بەشێوەی پراکتیک کاری بۆ مافەکانی خۆی کردووە (ئەگەرچی هەندێ سەرچاوە دەڵێن لیلی فواز بەر لە قاسم ئەمین لەسەر ژنی نووسیوە، بەڵام لەبەرئەوەی هەمیشە مێژووی ژن پشتگوێ دەخرێت، سەبارەت بەو بەرهەمە هیچ سەرچاوەیەکم دەست نەکەوت ئەو مەسەلەیە ڕوون بکاتەوە... ک.س) پاش ئامادەکردنی قۆناغە تیۆرییەکانە کە پێش بەشدابوونی ژن تەنیا بە سێ کتێب دەست پێ دەکات و هەر یەکەیان شۆڕشێکی گەورە بوو بۆ ژن، ئەو کتێبانەش ئەمانە بوون:

١- کتێبی (المرأة في الشرق) نووسینی (مرقي فهمي المحامي)، کە ساڵی لە چاپدانەکەی دیار نییە، بەڵام سەرچاوەکان دەیگەڕێننەوە بۆ پێش کتێبەکەی قاسم ئەمین.

٢- کتێبی (تحرير المرأة) لە نووسینی قاسم ئەمین ساڵی ١٨٩٩ بەچاپ گەیەندراوە.

٣- کتێبی (المرأة الجديدة) نووسینی قاسم ئەمین لە ساڵی ١٩٠٠ چاپ کراوە و کتێبەکەشی پشتگیری لە ڕا و عەقڵی ڕۆژئاوا دەکات بەرامبەر ماف و ئازادییەکانی ژن و بۆچوونەکانیان بەرامبەر ئاینی ئیسلام.

٤- لەم قۆناغەدا ژن هاتە بواری بیرکردنەوە لەو مەسەلەیە و بەشێوەی پراکتیک هاتە پێشەوە و گرووپێکیان بەسەرپەرشتیی (هدی ئەلشەعراوی) کە ناوی تەواوی (نورالهدی محمد سلطان)ە، واتە کچی محمد سولتان پاشا و هاوسەری (عەلی ئەلشەعراوی) بوو، گۆڤارێکیان بەناوی (السفور)ەوە بەچاپ گەیاند. ئەو خاتوونە و هاوەڵەکانی بەپشتگیریی ئەو کۆمەڵە پیاوە پێشکەوتووخوازە و هاوکاریی سەعد زەغلوول کاریگەریی زۆر گەورەیان لەسەر ژنی میسر و عەرەب بەگشتی هەبووە، هەر ئەوانیش بوون بەهۆی یەکەم جووڵەی لابردنی حیجاب لەناو عەرەب و لە میسردا، واتە ئەو پرۆسەیە لە دەسەڵاتەوە دەستی پێ کرد و لە هەرەمەوە بۆ دامێن بوو نەک پێچەوانە کە لە وڵاتانی تردا پەیڕەو کراوە، بەبەشداربوونی ڕاستەوخۆی سەعد زەغلول ئەو کارە ئەنجام دراوە، یەکەم قۆناغی ئەو کارەش بەو شێوەیە دەستی پێ کرد کاتێک سەعد زەغلوول وتاری دەخوێندەوە حیجاب و پەچە لەڕووی ئەو ژنانە دەکردەوە کە هاتبوون بۆ گوێ لێ گرتنی و خۆیشی حیجاب و پەچەی هودا ئەلشەعراویی بەدەستی خۆی لابرد ئەو کاتەی ئەلشەعراوی ڕۆیشتبوو بۆ پێشوازی سەعد زەغلوول لە ئەسکەندەرییە پاش گەڕانەوەی لە مەنفا، کە ژنەکانی هاوەڵیان بینیبوویان هودا حیجابەکەی لابرد ئەوانیش بەدوایدا حیجاب و نیقابی خۆیان لادابوو. دوابەدوای ئەم هەنگاوە هودا ئەلشەعراوی لە ساڵی ١٩٣٣ سەفەری ڕۆما دەکات بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی یەکێتیی ژنانی نێودەوڵەتی، پاش گەڕانەوەی لە ئەپریلی ساڵی ١٩٣٤دا یەکەم یەکێتیی ژنانی لە میسردا دامەزراند و سەرجەم داواکاری و پێشنیارەکانی (مرقی ئەلمحامی و قاسم ئەمین)یان کرد بەئامانج و پەیڕەو و پرۆگرامی خۆیان. ئەم خاڵانەیان کرد بەئامانجی تێکۆشانیان:



١- قەدەغەکردنی جیابوونەوە (تەڵاق) بەبێ ڕەزامەندیی حکوومەت و یاسا.

٢- قەدەغەکردنی فرەژنی.

٣- دواخستنی تەمەنی شووکردنی کچان بۆ پاش ١٦ شازدە ساڵی.

٤- یەکسانی لە میراتدا.

٥- ژنیش وەکو پیاو مافی تەڵاقدانی هەبێت.

٦- دەستەبرکردنی سەرجەم مافە سیاسییەکانی ژن.

لەوێوە کەوتنە تێکۆشانێکی بێ وچان و گەلێک دڵسۆز و لایەنگریان هێنایە ڕیزی تێکۆشانی خۆیانەوە و، بوون بەکۆڵەکەیەکی بەهێزی ژنانی عەرەب و دیارترین ئەو کەسانەش کە لەو سەردەمەدا بوون بەسیمبولی فیمینزم بریتی بوون لە:

١- شێخ محەمەد عەبدە ناوی شێخ محەممەد عەبدولوەهاب لە ساڵی ١٨٤٩ لە دایک بووە، یەکەم کەس بوو کە بانگەشەی دادوەریی کۆمەڵایەتی و چاکسازیی سیاسی کرد لە چەرخی نوێدا لەناو عەرەب، یەکێکە لە پێشەنگەکانی فیکری ڕینسانسی ئیسلامی و فیکری عەرەبی، ئەم پیاوە پاش ئەوەی ئومێدی بەو سیاسی و دەسەڵاتانە نەما کە چاکسازی سیاسی بکەن خۆی حزبێکی دامەزراند بەناوی حزبی نیشتمانیی ئازاد و لەوێوە هەرچییەک لە توانای ئەو بلیمەتەدا هەبوو خستییە ڕوو لە پێناوی ڕاڤەکردن و بڵاوکردنەوەی ئاینێکی سەردەم کە لەگەڵ پرسەکانی سەردەم و خواستی خەڵکدا بگونجێت، بەوە تاوانبارکرابوو بەپێی وتارەکانی ئەو و قسەکان و تەفسیرە نوێیەکانی بۆ ئایەتەکانی قورئان کە بڵاوی دەکردنەوە گوایە کتێبەکەی قاسم ئەمین ئازادکردنی ژن (تحرير المرأه) لەسەر بنەمای فیکری محەممەد عەبدە دامەزراوە و ئەو بیر و بۆچوونانەی داوە بە قاسم ئەمین دایبڕێژێتەوە... بەهەرحاڵ ئەو پیاوە ئاینی و بیریارە بەیەکێک لە کۆڵەکە بەهێز و نەپساوەکانی بزووتنەوەی فیمینستی عەرەب دادەنرێت،

کۆڵەکە بەهێز و نەپساوەکانی بزووتنەوەی فیمینستی عەرەب دادەنرێت، چەندین جار زیندان و دەربەدەریی لەسەر بیروباوەڕ و داخوازییەکانی خۆی بینیوە، بەڕادەیەک لەگەڵ ئەو باوەڕەی خۆیدا ماندوو بووبوو لە کۆتاییدا دەڵێ: (نەفرەت لە (ساس و یسوس[٢]) و هەموو ئەو شتانەی بەپیتی سین دەست پێ دەکەن) ئەم بڕوایەی پاش ژیانێکی پڕ لە چەرمەسەریی سیاسی و ماندوویەتی، لەسەر ئەو باوەڕە مایەوە هەتا لە ساڵی ١٩٠٥کۆچی دوایی کردووە.

٢- سەعد زەغلوول سەرۆکی حزبی وەفدی میسری.

٣- سەفییە زەغلوول هاوسەری سەعد زەغلوول و کچی مستەفا فەهمی پاشای سەرەک وەزیرانی ئەو کاتە.

٤- لوتفی ئەلسەید ئەم پیاوە پێشکەووتوخوازە ناوی نرابوو مامۆستای نەوەکەی خۆی، بیروڕاکانی خۆی سەبارەت بەئازادیی ژن و مافە پێشێلکراوەکانی، لە بلاوکراوەکانی حزبی گەلی میسری ئەو کاتەدا بلاو دەکردەوە. ئەم پیاوە یەکەم کەس بوو لەژێر کاریگەریی بیریدا قوتابییە کچەکانیان پۆشاکی سیڤیلی سەرەدەمیان پۆشی، پاش ئەم هەنگاوە یەکەم کەس بوو قوتابییە کچەکانی لەگەڵ قوتابییە کوڕەکان تێکەڵاو کرد و ئەو هەڵوێستەش بوو بەهۆی دامەزراندنی خوێندنی تێکەڵاو، گەرچی زۆر بەرپەرچی درایەوە و ململانێ کرا لەسەر ئەو بڕوایەی خۆی، بەلام کەسانێکی وەکو (تەها حوسێن و کامل مەرسی) پشتگیرییان لێ کرد و لەژێر پاڵەپەستۆی دەرەوەدا دائیرەی مەعاریف ڕازی کرا بەوەی ئەوە مافی ژنانە و پێویستە دەست نەهێنێتە بەر ئەو تێکەڵاوبوونە.

٥- هودا ئەلشەعراوی کە پێشتر باسی نەسەب و چالاکییەکانیمان کرد. (ئەم ژنە لە میانەی سەردانەکەی ڕۆمادا سێ جار سەرکردەی داگیرکار مۆسۆلۆنیی بینیوە و سۆزی گەرمیان گۆڕیوەتەوە، پێی گوتووە: (من بەبایەخەوە چاودێریی بزووتنەوەی ڕزگاریی میسر دەکەم)).



٦- سیزا بەنداوی ناوی تەواوی زەینب محەمەد موراد و سکرتێر و هاوڕێی نزیکی هودا ئەلشەعراوی بوو و یەکەم کەس بوو حیجابی فڕێ دا بەخواستی خۆی پاش گەڕانەوەی لە ڕۆژئاوا. جگە لەوەی یەکەم ژن بوو یەکێک لە بەندەکانی داواکارییەکانی خۆیانی پراکتیک کرد ئەو بەندەی دەیگوت پێویستە ژنیش وەکو پیاو بتوانێت جیابوونەوە (تەلاق)ی بەدەست بێت، بۆیە مەرجی هاوسەرکردنی سیزا لەگەڵ هونەرمەند مستەفا نەجیب ئەوە بوو کە تەلاق بەدەستی سیزا بوو.

٧- دورییە شەفیق، ئەم خاتوونە یەکێک بوو لە قوتابییەکانی لوتفی ئەلسەید و یەکێکیش بوو لەو ژنانە لەگەڵ ئەوەی ئەو کاتە زۆر گران بوو لە ڕووی شەرعییەوە، قەدەغەبوو ژن خۆی بەتەنیا سەفەر بکات بۆ دەرەوەی وڵات و بەلام ئەو سەفەری کرد بۆ فەرەنسا و لەوێ دکتۆرای هێنا و هەر لەوێشەوە ڕۆیشت بۆ بەریتانیا، چەندین ساڵ مایەوە و کاتێکیش گەڕایەوە بۆ میسر لە ساڵی ١٩٤٩ بەیارمەتیی باڵیۆزی ئەمریکی و ئینگلیز حزبی کچی نیل (بنت النیل)ی دامەزراند، ئەم ژنە بەیەکێک لەو یاخییانە ناسرابوو کە زۆربەی خۆپێشاندانەکانی ئەو سەردەمەی میسری ڕێک دەخست، بەناوبانگترین خۆپێشاندانیشیان لە ١٢ی مارسی ١٩٥٤دا بوو کە ژنان لە سەندیکای ڕۆژنامەنووساندا مانیان گرت، لەو مانگرتنەشیاندا لێیان مرد، بەلام هەتا کۆمەڵێک لە داواکارییەکانیان جێبەجێ نەکرا وازیان نەهێنا و کۆڵیان لە چالاکی و مانگرتن نەدا و چەند خۆپێشاندانی تری لەو شێوەیە لە مێژووی ئەو گرووپەدا هەیە. ئەم ژنە هێندە سەخت دەستی پێ کردووە، سەرەتای تێکەڵاوکردنی کچان و کوڕان بەیەکەوە ئەو کاتەی لە نێوان هەردوو مامۆستایدا لوتفی سەید و تەها حوسێن لە ١٩٣٢ وێنەیەک دەگرێت، کۆنە خوازەکان ئەو وێنەیە دەگرن بەدەستەوە لە پەرلەماندا بەلادانی ڕەوشتی دەژمێرن و داوا دەکەن بەر بەوجۆرە بێ ئابڕووییە بگیرێت) ١٠ و ١١

٨- ئامینە ئەلسەعید، ئەویش یەکێک بوو لە قوتابییەکانی تەها

حوسێن و داکۆکیکارێکی سەرسەختی بزووتنەوەی ژنان و سەرنووسەری گۆڤاری (حەوا) بوو.

٩- بەر لەو ژنانەش ژنە نووسەری میسری (مەی زیادە) ساڵی ١٩١٥ بەکردنەوەی ئەو ساڵۆنە ئەدەبییەی کردبوویەوە ژنان و پیاوانی ڕۆشنبیری تێدا کۆدەبووە، لەو سەردەمەدا کە ئەو ئاکارە بەتاوانێکی گەورە دەژمێردرا، کاریگەرییەکی باشی بۆ سەر هۆشیارکردنەوەی ژنانی عەرەب هەبوو.

١٠- د. نەوال ئەلسەعداوی. پاش ئەمانە نەوال ئەلسەعداوی بوو بەئەستێرەیەکی دیاری جیهانی ئافرەتان، دەتوانم بزووتنەوەی ژنانی میسر لە میانەی نەوال سەعداوییەوە بەفیمینست ناوزەد بکەم و، جگە لەوەی سکرتێری یەکێتی ژنانی میسر بوو و سەرنووسەری گۆڤاری (نوون)یش بوو کە بەتەواوی گۆڤارێکی فیمینستیانە بوو، ئەمە جگە لەوەی لەپاش قاسم ئەمین نووسینەکانی نەوال ئەلسەعداوی توانیویەتی کاریگەریی زۆر و مشتومڕ و کاردانەوەی توندی لێ بکەوێتەوە لەنێو ناوەندی عەرەبیدا چ ئاینی و چ سیاسی و کۆمەڵایەتی. سەرباری ئەوانەش کە فیمنیست هێزی هزر و ڕۆشنبیری و توانای ژن دەکات، دەتوانین بڵێین نەوال سەعداوی جیاواز لە سەرجەم ژنە دیارەکانی میسر بەهێزی هزری و بیروباوەڕ و توانای خۆی کاری کردووە وەکو ژنەکانی تر دەسەڵاتی پیاوانی دەسەڵاتداری لەپشت نەبووە بۆ ئەوەی بۆ نیوەیەکی چەوساوەی کۆمەڵەکەی بیر بکاتەوە، جگە لەوەی ناکۆکییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی میسردا هەمیشە لە لوتکەدا بووە. هەر بەهۆی بیروباوەڕی فیمینستی و پێشکەوتووخوازی خۆیەوە لە نەخۆشخانەکانی میسر دەریان کرد لە کارەکەی و ڕووی کردە ئەمریکا بۆ کارکردن.

دەتوانین بڵێین ئەو پێشکەوتنانەی کە ژنی میسری پێ گەیشت لە هەموو بوارەکانی زانست و ئەدەب و هونەر و کۆمەڵایەتییەوە لەسەر دەستی ئەو کۆمەڵە ژنە هاتنە ئاراوە و، ژنی میسری و پیاوانی پێشکەوتووخوازی میسربوون بەهەوێنی دروست بوونی بزووتنەوەی ژنان لەناو عەرەبدا و



لەوانەوە و لە ڕێگەی نێردراوی ئەوانەوە بۆ هەندێ وڵاتی تری عەرەبی بزووتنەوەی ئافرەتان لە نیشتمانی عەرەبیدا هاتە ئاراوە و ڕێکخراو و سەندیکای هەمەجۆریان دامەزراند و، لەگەڵ ئەوەشدا کە ژنانی میسر زیاتر لە سەدەیەکە و زیاتر لە سەرجەم وڵاتانی عەرەبی بۆ مافەکانیان بەشێوەی پراکتیکی تێ دەکۆشن بەڵام تا ئێستا نیوەی خەونەکانیان لەبار براوە و لە ڕووی سیاسی و بڕیاردان و یاساکانی کاروباری کەسییەوە هەوڵەکانیان ناگات بەکاروان، دیسان زۆربەی وڵاتانی تری عەرەبیش نەگەیشتوون بەو مافانەی ژنان و فیمینستی میسر پێی گەیشتوون. لەگەڵ ئەوەی هەوڵی فیمینستیانەی نەوال سەعداوی خۆی دەدات لە نیو سەدە بەڵام هەتا ئێستا بزووتنەوەی فیمینستی بەهێز لە میسردا بوونی نییە و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٩٤دا بزووتنەوەی فیمینزمی دامەزرا و زیندووبوونەوەی بەهێزی لە ساڵی ٢٠٠٢، هەروەها لە یەمەندا ساڵی ٢٠٠٣ لە لوبنان هەمان ساڵ و لە سوریا ساڵی ٢٠٠٣ دامەزراوە، دیارە هیچ بزووتنەوەیەک لە سوریا متمانەی ناخرێتە سەر و دروستبوونە تەنیا لە پێناوی ناودا. لە وڵاتانی تر عەرەبیشدا هێشتا زۆری ماوە بیر لە مافی ژن بکەنەوە هەتا بتوانن بیر لە فیمینستی بکەنەوە، لەم ڕوانگەیەوە دەبینین سەرهەڵدانی فیکری فیمینزم و ژنی فیمینیست لەناو عەرەبدا زۆر دواکەوتووە لە ڕووی کات و ناوەڕۆکەوە و، زۆر لاوازە لە ڕووی تەشەنەکردنەوە، لە ڕووی زانستیشەوە نەیانتوانیوە لە نیوە بەتاڵی پەرداخەکەیان بکۆڵنەوە، بەراورد بەمێژووی بزووتنەوەکانیان و بەراورد بەو ئازادییەی لە هەندێ لە وڵاتەکانیاندا بۆ ژن فەراهەم هاتووە زۆر دواکەوتووە و لاوازە.

## سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ژنانی کورد:

مێژووی دەسەڵات و ڕامان و بیرکردنەوە و زانستخوازی ژنی کورد لە ڕووی مێژووییەوە پێش ژنی عەرەب کەوتووە، بەڵام لەبەرئەوەی کورد بایەخی بەمێژووی ژن نەداوە، گرانترین شت لێکۆڵینەوەیە دەربارەی ژنی کورد،

چونکە هیچ سەرچاوەیەک دەست ناکەوێت کە بتوانرێت پشتی پێ ببەسرێت و بتگەیەنێت بەڕاستییەکان، بەڵام دەتوانین بڵێین لەگەڵ دروستبوونی بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و زانستی و سیاسی و فیمینستیەکاندا بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم و پاش جەنگی جیهانی یەکەم ئەوەی ژنی کورد کردوویەتی جێگەی تێڕامان و سەرسووڕمانە لەنێو نەتەوەیەکدا کە نەخوێندەواری و باری خێڵەکی و فیودالیزم باڵی بەسەردا کێشابێت و، ژن بتوانێت بگات بەو ئاستە بەرزەی فەرمانڕوایی و زانست و سیاسەت، ئەو توانایەی ژنی کورد لەو کاتەدا گەڕیدە ئەوروپییەکانی هێندە سەرسام کردووە بەچەندین لێکۆڵینەوە و بەدواداچونیان لەسەر کردووە و بەبەرز و گەورە نرخاندوویانە[٣]. مێژووی کورد سەدان ژنە شۆڕشگێڕ و خاوەن هەڵوێست و ڕۆشنبیر و دانا و خوێندەواری لەخۆ گرتووە وەکو (خاتوو شاناز، فاتمە کوردی، عیسمەت ئەیووبی، ست ئەلعیراق، مۆسە خاتوون، عەزراو خاتوون، عادیلە خانم، زومورده مەلیکە، فاتیمە خانی قەرەچێواری، زەهرە، (ڕبیعە و ست ئەلشام)ی خوشکی سەلاحەدینی ئەیوبی، شاە خاتوون، ولیە خانم ئەردەڵانی، عازییە خاتوون، فاتمەخانی ڕەواندزی، عیسمت قازی محەمەد، خانزاد، کچە نەغەدەیی، عایشە تەیموور، حەیران خانی نەخچەوانی، ئامینە خانی بارام بەگ، نەسیب خاتوون، خاتوو خورشید ئەسعا، فاتیمە هەکاری، ئاتەخان، فاتیمە ئەیووبی، حەلیمە، سری خامی دیاربەکری، حەپسەخانی نەقیب، پیرۆز کچی شاعیری کورد حەسەن کەنۆش، (لەیلا و ڕەوشەن) بەدنهانم، برا حەلیم و مەها نێرگز، دکتۆرە زەری یوسب، میهرەبان بەرواری و ستیتە و مەستورەی کوردستانی و... تاد ئەمانە بەشێکی کەمی ئەو ژمارە زۆرانەی ژنی کورد بوون سەکۆی زانست و چاکسازی و ڕاوێژکردنی پیاوان و دروستکردنی قوتابخانەیان لە چەند شوێن و وڵاتی جیاوازدا گرتبووە دەست. کەچی وەکو حوکمڕانی کردن و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی هەمیشە هەوڵدراوە لە پاشکۆی پیاوی عەشیرەتەکانیاندا بن و مانگی دەسەڵات



تەنیا لە شەوی پیاودا هەڵبێت. جگە لە خانزاد کە سەرۆکایەتیی ئیمارەتی سۆرانی کردووە، ولیە خانم ئەردەڵانی ژنی خەسرەوخانی کوڕی ئەمانوڵڵا بووە، لەپاش مردنی مێردەکەی فەرمانڕەواییی ئەردەڵانی گرتووەتە دەست و غازییە خاتوون فەرمانڕەوایی شاری (محاە)ی کردووە، شا خاتوون ژنی میر شەمسەدین بووە، پاش کۆچی دوایی میر فەرمانڕەواییی ناوچەکەی کردووە، هەروەها فاتیمە خانی ڕەواندزی، پاش مردنی مێردەکەی ئیش و کاروباری هەشت دێی گرتووەتە دەست و، ئەو توانا و ئەمەکەی لە ماە شەرەفخانی کوردستان جگە لە ڕووی ڕۆشنبیری و توانای داهێنانی و فەرمانڕەوایی کردن کە پاش مردنی هاوسەرەکەی فەرمانڕەواییی میرنیشینی لوڕی بچووکی گرتبووە دەست.

هەروەها ئەو ڕۆڵەی مینا خانمی ژنی سەرکردەی مەزن قازی محەمەد گێڕای بۆ خزمەتی ژنی ئەو ناوچەیە و هەوڵدانی بۆ دامەزراندنی یەکێتی ئافرەتان و چاکەخوازی و خزمەتکردنی بەخەڵکی ناوچەکە ڕوویەکی تری گەشی ژنی کوردە، هەروەها ژنانی سلێمانی بەتایبەتی و کورد بەگشتی هەردوو مامۆستای زانست ژن لە و شارەدا لەیاد ناکەن ئەوانیش خاتوو فاتیمە محێدین یەکەم مامۆستای ژن بوو لە سلێمانیدا، کە لە ساڵی ١٩٢٥ ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی هاوسەری قوتابخانەیەکی بۆ ژنان هەر بەناوی خۆیەوە بۆ کردەوە و لەوێدا لەگەڵ مامۆستا پێشەنگی زانست گوزیدە خانم زیاتر لە ٣٥ ساڵ خزمەتی ژنی ئەو شارە و ژنی کوردیان کرد و وەکو ژنە نووسەرەکانی ئێستا بەهەزاران ناوناتۆرە و سووکایەتییان پێ کرا تا ئەو کاروانەیان گەیاندە مەبەست و، زانست و خوێندەواریی خۆیان گەیاند بەژنان و کچانی ئەو شارە و بوون بەهەوێنی خوێندەواری و تێکۆشان بۆ بنبڕکردنی ساتۆری نەخوێندەواری کە هەمیشە ژیان و ملی مرۆڤی کوردی دوو کەرت کردبوو بەتایبەت ژنان هەر بۆیەش لە سەرجەم مافەکانیان بێ بەری بوون، هەروەها ئەو شەرەفمەندییەی تا ئێستا لەیلا زانا بە ژنی کوردی دەبەخشێ و لەیلا قاسم پێی بەخشیوون لە مێژووی کەم

گەلدا رووی داوە، دووبارە بوونەوەشی کاری دەگمەن و مەزنە، جگە لەوەی ژنی کورد لەگەڵ بزووتنەوەی ژنی جیهاندا و بەر لە بزووتنەوەی ژنی عەرەب خاوەنی بزووتنەوە و رێکخراوی ژنانە بووە(٤) لە دوای شەڕی یەکەمی جیهان و لە ساڵی ١٩١٩ بۆ یەکەمین جار، لەمەڕ زانیاری و هەواڵەکانی سەرچاوەکانی مێژوو، یەکەمین رێکخراوی ژنانی کورد لە ئەستەمبۆل دامەزرێنراوە، کۆمەڵێ لە هاوسەرانی پیاوانی ناودار و رۆشنبیری کورد لە بەهاری ١٩١٩ کۆمەڵەی پێشخستنی ژنانی کوردیان لەو شارەدا دامەزراند (Kurd Kadinlari Teali Cemyeti). ئەم کۆمەڵەیە لە سێبەری کۆمەڵەی پێشخستنی کوردستاندا (Kurdistan Teali Ce-miyeti) کە زۆربەی هەرە زۆری سەرکردە بەناوبانگ و رۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمەی لە ریزەکانی خۆیدا کۆکردبووەوە، سازکرا و دەستبەکار بوو.

لێرەوە هەتا ئێستا هیچ سەرچاوەیەکم دەست نەکەوتووە کە لەوە زیاتر خەباتی ژنی کورد بەتایبەت خەباتی رێکخراوەیی دەربخات، پێ دەچێت پاش ئەوە کەمالیستەکان ئەو خەونەی ژنی کوردیان وەکو خەونی سەرجەم نەتەوەکەی لەبار برد ئیتر بارودۆخی ژنی کورد لە ئاستی وەستاودا مابێتەوە و هەتا ئەو هەوڵانەش لەلایەن ژنە ناودارەکانی کوردەوە دراوە و، لەلایەن خێزانی قازی محەمەدەوە دراوە کەوتووەتە پاریزی چەوساندنەوەی نەتەوەیی(٥) هەتا ساڵی ١٩٨٩ ژنانی کورد بەکۆشش و خەباتی خۆیان لە شۆڕشی گەلی کوردا کە لە ساڵی ١٩٧٥ەوە هەڵگیرسایەوە، بڵاوکراوەی شاخ، رۆڵێکی باشی گێڕا لە هەلومەرجی سەختی پاش هێرشەکانی ئەنفال و جینۆسایدی کورد، چەند ژنێکی تێکۆشەر و پێشمەرگە کە توانیان کۆمیتەی بەرێوەبردنی یەکێتی ژنانی کوردستان دابمەزرێنن* و هەر لەو

* سەرنج: "یەکێتیی ئافرەتانی کوردستان" وەک یەکەم رێکخراوی پیشەییی ئافرەتان لە کوردستانی عێراقدا زۆر لەمە کۆنترە، بەڵام نووسەری بەرێز ئاماژەی نەداوەتێ. هەروەها لە شۆڕشی مەزنی ئەیلوولدا ١٩٦١-١٩٧٥ زۆر ئافرەت هەبوون بەشدارییان لە خەباتی پیشەیی و سیاسی و پێشمەرگایەتیدا کردووە. دەزگای ئاراس.



ساڵەشدا گۆڤاری (تەوار) بەدروشمی -ژن - خەبات - ژیان دەربکەن، ئیتر ئەوەبوو بەبنچینەی خەباتی ژنان لە رووی راگەیاندن و پێوەندیکردن و زانیاری گۆڕینەوە لەنێوان ژنانی شاخ و شاردا و خەباتی ژنی کورد لە هەتا ئەمڕۆ.

## خەباتی ژنی کورد فیمینزمییە؟

## (مێژووی درێژ و کاری کەم)

پێشتر ئاماژەیان بووە کرد کە فیمینزم واتە مێیەتی یان کۆبوونەوە و خڕبوونەوە لە دەوری مێینە و کێشەکانیدا، هەوڵدان بۆ چارەسەرکردن و بەئامانج گەیشتنی خواستەکان لە روانگەی ژن- ئافرەت خۆیەوە، بڕیاردان و بەرخودان و لە بیروهۆش و هەستکردن بەنەنگییەکان لە نەست و کرداری خۆیەوە، فیمینزم کارکردن نییە لە پێناوی کارکردندا، بەرگری نییە لە پێناوی دەرکەوتندا، فیمینست ئەو مرۆڤەیە هەست دەکات هەڵەیەک هەیە پێویستە راست بکرێتەوە کە پێویستە ئەمە هەستی مرۆڤی نووسەریش بێت هەست دەکات ناشیرینییەک هەیە پێویستە جوان بکرێت بۆی تێ دەکۆشێت، مرۆڤگەلێک هەیە مافیان دەخورێت و دەچەوسێنرێنەوە پێویستە مافەکانیان بۆ وەدەست بهێنێت، فیمینست زانستە، رەوشتە، مۆراڵە، مرۆڤدۆستییە، هەر بۆیە هەموو کەس لە رەوشی تێگەیشتن و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو زانستە تێ ناگات، بەباوەڕی من ناکرێ هەموو ئەوانەی ناوی خۆیان دەنێن بەرگریکار لە مافی ژن و تەنانەت زۆر رێکخراو و گرووپیش پێیان بگوترێت فیمینستی.

خەباتی درێژ، مێژووی کەم، چالاکی ژنی کوردیش هەر لە سەرەتاوە زۆربەی ناچێتە مەیدانی چالاکی و هەوڵی فیمینستییەوە، چونکە ئەگەر:

* سەیری فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی سیاسیی ژنانی کورد بکەین لە رابردوودا دەسەڵاتێکی فیوداڵیزمی بۆ ماوەیی بووە، ئەوەش دەری دەخات،

ئەو چەند ژنە کەمەش گەیشتوون بەناوەندی دەسەڵات و سەنتەری بڕیاردان بەتەنیا لە ڕێگەی توانا و ڕۆشنبیریی سەربەخۆیی خۆیانەوە نەبووە بگرە وەکو میراتگر و جێگریی پیاوێکی کردووە و کارەکانی ئەوی گرتووەتە ئەستۆ و، جێبەجێکاری بڕیارەکانی پیاو بوون.

* ئەوکاتە و ئێستاش ژنی ناودار و چاکەخواز ئەوەیە گوێڕایەڵ و کارەکەری پیاو بێت، چونکە لە بنەمادا بەدەستهێنانی دەسەڵاتەکەی دەسەڵاتێکی پیاوانەیە، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو ژنانە بەتوانا و بەهێز و کارامە بوون لە دەسەڵاتی فەرمانڕەواییی خۆیاندا، بگرە تەنیا ئەوەندەیە کە دەسەڵاتەکەیان فیمینستی نەبوون.

* هەروەها هەندێکی تریان زیاتر پەیوەستی مەسەلەی مرۆڤایەتییەکان بوون بەگشتی نەک مەسەلەی ژن وەکو ڕەگەزێکی پێویست بەداکۆکیکردن، لە باشترین حاڵەتیشدا ئەوانە لە ڕابردووودا سەرجەمیان مەحکووم بوون بەکۆت و زەنجیرە نالەبارەکانی کۆمەڵگە، لە لایەک لەوانەیە ئەو خاتوونانە ئەگەر خێزان و خوشکی ئەو سەرۆک عێل و عەشیرەت و سەرکردانە نەبوونایە کۆمەڵێ کوردی هیچ حسابێکی بۆ نەکردنایە هەروەکو تا ئێستاش کۆمەڵی کوردی متمانە و باوەڕ و ڕێزیان بۆ ئەو ژنانە کەمترە کە بەهێز و توانا و ڕۆشنبیریی خۆیان هاتوونەتە هەر مەیدانێک لە مەیدانەکانی ژیان هەتا ئەو متمانەی بەخوشک و خێزان و کچی دەسەڵاتدارەکان دەکات، واتە ئەو ژنانەی هێزی دەسەڵاتێکی پیاوانەیان لە پشتە.

* دیسان باری نالەباری کۆمەڵ وای کردبوو ئەوان زیاتر هەوڵیان بۆ ڕازیکردنی خەڵک بێت کە ڕوو لە خوێندن بکەن ئەو دەردەی کە چارەنووسی گەلی کوردی بەتاریکی سپارد، تووشی دەیان کێشەش بوون بەهۆی ئەوەی ژنانیان هان دەدا بۆ خوێندن و بواریان بۆ دەکردنەوە و لەو ڕووەوە پێداویستییەکانیان جێبەجێ دەکردن. واتە کۆمەڵی کوردی لە ئاستێکدا بوو کە پێویست بوو خەبات بۆ پێویستییە هەرە سەرەتاییەکان



بکەن بۆ مرۆڤ بەگشتی نەک ژن بەتایبەتی.

* لە لایەکی تر نەتەوەی کورد هێندە ژێردەست و چەوساوە بووە هێندە پێویستی بە ژنە داناکان بووە کە بەرگری لە نەتەوەکەی بکات، ژن خۆی هێندە پێویستی پێ نەبووە بەرگری لێ بکات، ئەوەش دۆخ و کارێکی نائاساییە چونکە نەتەوەی کورد بێ ناسنامە و ئازادی بووە، کاتێکیش نەتەوەیەک سەربەخۆ نابێت، ژێردەست و مافخوراو بێت خەمەکانی سەرەتا لە دەوری ڕزگارکردنی گشتی و نەتەوەیی کۆ دەبێتەوە، پاش ئەو ڕزگاربوونە لە تاک و چینەکانی تر نزیک دەبێتەوە، لێرەوە ئەرکە نەتەوەییەکە لەبەردەمیدا زیاتر زەق دەبێتەوە هەتا ئەرکی هاوڕەگەزی.

* لەناو کوردا ژنی عاقڵ و سەلار و دانا ئەوەیە کە گوێڕایەڵی پیاوە، بەڵێکار و شەرمن و بەرگری نەکار بێت، هەتا ئێستاش ئەو بارودۆخە تا ڕادەیەکی زۆر هەروایە، بۆیە زۆرێک لە ژنان گەرچی درک بەکەموکوڕی و پێویستییەکان و داکۆکیکردنیش دەکەن، دیسان پێیان باشترە گوێڕایەڵ و بێدەنگ بن و، بێ دەسەڵاتییەکە هەڵدەبژێرن.

* کورد بەهۆی ئەوەی هەر چوار لای دوژمن و چەوسێنەر بووە، پێشکەوتنەکانی ئەوان (گەرچی کەمیش بوون) سەرسامی نەکردوون، نەبووەتە هۆی گۆڕانکارییەکان، ئەورووپاش دیسان بۆ عەقڵییەتی ئەو کۆمەڵە هەرەس نەکراوە و بەناموسڵمان ژمێردراون و هیچ کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی نەبووە لەسەریان.

* نەخوێندەواری یەکێک بووە لەو پەتایانەی جیهانی ژنی تاریک کردووە و هەتا ئێستاش تووشی ژنی کورد دەبێت بەبێ چارەسەرکردن.

* نەبوونی سەرچاوە بەکورد هۆکارێکی تر بووە، ژنی کورد ئەوانەشیان کە خوێندەوار بوون کتێب و سەرچاوەی کوردییان لەبەردەستدا نەبووە سەبارەت بەماف و چەوساندنەوەکانی خۆیان، ئەوکات تەنیا شیعری کۆمەڵێک شاعیر هەبووە نەک هیچ جۆرە لێکۆڵینەوە و بابەتێکی فیکری لەسەر ژن.

* لەگەڵ ئەوەی مێژووی ڕاگەیاندنی کورد لەگەڵ مێژووی ڕاگەیاندنی وڵاتانی (لوبنان) کە گەورەترین سەنتەری ڕاگەیاندنی ڕۆژهەڵاتە تەنیا چەند ساڵێک جیاوازییان هەیە و نزیکن لە یەکەوە بەڵام بەدرێژی ئەو هەموو ساڵە ڕاگەیاندن نەکراوە بەئالییەتی ڕیشەکێشکردنی چەوساندنەوەی ژن لایەنی کەم لە نێو ڕاگەیاندنەکە خۆیدا، ژن و ڕاگەیاندن هەتا ئێستاش هاوتەریب نابن و ڕاگەیاندن بۆ ژن زۆرجار ئاکامی خراپی لێ دەکەوێتەوە بەعەقڵی کورد.

* دوو فاقییەتی ڕۆشنبیری کورد بەرامبەر چالاکییەکان و ژنانی دەرکەوتوو دانا و دیاری کورد، ئەمەش بەتەواوی لە ژیانی و یەکەم ژنە شاعیر مەستوورەی کوردستانی هەتا ئەمڕۆ ڕیزی یاخیبوونە جوانەکانی ژن ناگیرێت.

ئەو جۆرە ئاکار، کردار و پەرچەکردارانە هیچیان لەنێو پێناسەی فیمینستیدا جێگەیان نابێتەوە و بۆیە هەتا ئەو سەردەمە خەباتی ژنی کورد فیمینستی نەبووە و، ئەگەر سەیری خەباتی نوێی ژنان لە ڕیزی شۆڕشی کورد و سەربەخۆییدا بکەین، کە خەباتی ژن لە چوارچێوەی ڕێکخراوی ژنانەدا ئاقاری گرتووە، ڕووبەڕووی هەمان گرفت دەبنەوە، ئاکامی فیمینستی لێ نەکەوتووەتەوە.

**ئایا ڕێکخراوەکانی ژنانی کورد فیمینزمین؟**

پێم وانییە بزووتنەوەی فیمینستی لەناو کوردا هەتا ئێستا هەبن و نە لەڕووی مێژووییی و نە لە ئێستاشدا، ژنانی کورد تەنانەت زۆریان سڵ لە وشەکە خۆشی دەکەنەوە، ئالۆدەی دەکەن بەبۆچوونی هەڵە و دواکەوتوویەتی، هەتا ئێستاش بزووتنەوەی ژنی کورد بزووتنەوەیەکی ئیفلیج و بێ دەسەڵاتە، ئەگەر لە ڕابردوودا کوێلەیی و پاشکۆی عەقڵی پیاوانی خێڵ و عەشیرەت بوون ئێستا پاشکۆی عەقڵی پیاوانی حزب و دەسەڵاتن و بزووتنەوە و بەرژەوەندی ژنی کوردیان بردووەتە ئاستی



بەرژەوەندی حزب و دەسەڵاتدارە سیاسییەکان و ئەم ڕێکخراوە حزبییانە لەبەر هاوکاری بەبزووتنەوەی ژنی کورد گورزی کوشندەشیان لێ داون بەوەی جارێکی تر ئەو ژنانەیان گەڕاندەوە دواوە کە لە سەرەتاوە پێیان وابوو ئەو ڕێکخراوانە بەرئەنجامی خواست و داواکانی ژنە و خۆبەخت کردووی ڕێگەی ئازادیی ژنانن، بەڵام هەر زوو تووشی شۆک بوون کاتێک زانییان ئەو بزووتنەوانە وەکو سەرجەم ڕێکخراوەکانی لاوان و پیشەکاران و پزیشکان و ڕۆژنامەنووسان... تاد کە سەرجەمیان تەنیا وەکو کۆمیتەیەکی حزبی بەکار دەهێنرێن بۆ کۆکردنەوەی ئەندامە حزبییەکان، ڕێکخراوەکانی ژنانیش شوێنی کۆبوونەوەی ئەندامە حزبییەکانن، لە لایەکی تریشەوە پەردەپۆش کارێکی گەورەی کردەوە نابەجێیەکانی لێپرسراوەکانن، تا ئێستا سێ کوچکەی کەسایەتیی ژنی کورد لە سایەی ئەو ڕێکخراوانەدا هەر ماڵ و منداڵ و پیاوە و چونکە پیاوانی لێپرسراو یان ژن تەنیا وەکو جەستە دەبینن و بانگەشەی ڕووکەش نەبێت هیچی ڕاستەقینە و مۆدێرنیان پێشکەش بەژن نەکردووە، بەتایبەت لە ئێستادا کە ژنی کورد لە نێوان دوو فاقییەت و دووڕیانی توندڕەوی هێزە ئوسولییەکان، سەلەفییەکان و کۆنەپارێزەکاندا دەتلێتەوە، یەکێکیان توندڕەوانە دژ بەمرۆڤ و ژنە و ئەوی تریشیان توندڕەوانە باوەڕی بەمافی یەکسانی ژن و پیاو نییە، جا ئیتر ماوەتەوە سەر ژنان خۆیان کام ڕێگە هەڵدەبژێرن و دەیگرنە بەر، بەو دۆخەی ئێستاش بزووتنەوە و ڕێکخراوەکانی ژنانی کورد لە کوردستاندا ئەو کارانەش ژنان لە ڕابردوودا کردوویان بەخەساری دەسپێرن، چونکە تا ئێستا جێگەی ئومێد نین و ئەم چەند خاڵەش سیمای زاڵی پێشکەوتن و دادوەری و تێکۆشانی ئەوانە بۆ ژنان – ئافرەتان لەوانەش:

١– زاڵبوونی ڕۆحی حزبی بەسەر ڕێکخراوەکاندا.

٢– دەسەڵاتپەرستی چ وەکو دەسەڵاتی سیاسی و چ وەکو ئەو دەسەڵات و عەقڵە پیاوانەی کە ئەوانی دامەزراندووە و هاوکاریی هەبوونیان دەکات.

٣- باشکۆبوونی فیکرییان بەفیکری پیاوەوە لە ڕووی بیرکردنەوە و تێڕوانین بۆ کێشەی ژن.

٤- تەنیا جێبەجێکاری خواستەکان و بڕیارەکانی پیاوانی دەسەڵات لە ڕووی دەسەڵاتەوە.

٥- ترسان لە کارکردن و کردنەوەی سەندیکای بازرگانی بۆ ژنان، پاشکۆبوونی گیرفانی ژن دەگەڕێتەوە بەگیرفانی پیاوەوە.

٦- نەبوونی پڕۆژەی بەرهەمهێنەر و زیاتر خۆ خەریککردن بەپڕۆژەی ئیستیهلاکییەوە.

٧- نەبوونی سیستەمێکی پێشکەوتوخوازانەی گونجاو لەگەڵ پرسیارەکانی ئەو سەردەمەدا یەک بگرێتەوە لە پڕۆگرام و کارکردنیاندا.

٨- توندڕەویی حزبی لەنێو ڕێکخراوەکاندا بەڕادەیەک ئەگەر پیاوێک یان حزب لە ژنێک نارازی بوو ڕێکخراوەکانی ژنان بەر لە هەموو کەس ڕێگەی لەناوبردن و سووکایەتیکردن بۆ ئەو ژنە خۆش دەکەن و جگە لەوەی تەنیا ژنی حزبی لای ئەوان جێگەی متمانەیە چونکە لە بنەمادا ئەوان کاری حزب دەکەن و لە حزبەکە خۆشی توندڕەوترن و لە هەر شوێنێکیش توندڕەوی هەبوو دۆڕانیش هەیە، چونکە توندڕەوی واتە ئوسولییەت، هەرجۆرە ڕەوتێکیش گەیشت بەڕادەی ئوسولییەت ئیتر چ ئوسولییەتی ئیسلامی، حزبی و نەتەوەیی و چەپڕەوی... تاد، ڕەوتی پێشکەوتن و هەوڵی ڕاستەقینە لەخۆ ناگرێت. لەسەر زەوییەکی فشەڵیش وەستاوە باوەڕی داکوتانی بتەوی زۆر کەمە.

٩- نەبونی متمانە یەکەم بەخود و دووەم قبوڵ نەکردنی بەرامبەر تا ڕادەیەک کە ڕێکخراوی ژنانی یەک حزب دەبن بەچەندین تەکەتول و دژی یەک دەوەستن. جگە لە دژایەتیکردن بەپێی دژایەتی حزبەکانیان لەگەڵ لایەن و حزب و کەسەکانی دیدا.

١٠- باوەڕبوون بەهەندێ سەرکەوتن و گەشەکردنی کارتۆنی



دروستکراو، بەتایبەت کە ژمارەیەکی زۆریان فەنتازیییانە چوونەتە ئەو شوێنانە بێ ئەوەی خاوەنی هیچ توانا و ڕۆشنبیرییەک بن.

١١- خەونی باڵابوون لە وڵاتێکی بستە باڵادا، ئەمەش وای لێ کردوون بەشێوەیەک مامەڵە بکەن و بچنە ژێر ڕکێفی پیاوانی دەسەڵاتەوە کە دڵیان گەرد نەگرێت و ئەگەر ئەو مەزنە دوژمنی ژنیش بێت، گرینگ ئەوەیە ئەو کە فانتازییانە چووەتە سەر دەسەڵات و فەنتازییانە بووە بەناو و بووە بەمافخواز و مرۆڤدۆست و تا چەند گوێڕایەڵ و بەڵێکەری وتەکان و خواستەکانی دەسەڵات و پیاوانی دەسەڵات بێت ئەوەندەش مەزنە و ئەوندە فەنتازییانەتر پلەی دەدرێتێ... ئەمەش هەمان پڕۆسەیە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبووە کە ڕێکخراوە حزبییەکانی ژنی کورد لە کوردستاندا کردوویانە بەنەریتی مۆدێرنە کۆمەڵێ هۆیان ڕیز کردووە و دەرخواردی خەڵکی دەدەن.

هیچ کام لەو فاکتەرانە و، فاکتەرەکانی تر کە ژنانی ڕێکخراوەکانی پێ گرفتارن ناچنە نێو فیکری فیمینزمەکە تەنیا متمانە دەخاتە سەر جیهانبینیی ژن بەبێ دەستتێوەردان و پلانڕێژیی عەقڵییەتی پیاوانە، کەواتە هەڵەیە کاتێک دەبینین هەندێ کەسی ڕێکخراوەکان یان کەسانی نێو ڕێکخراو و دەزگا حزبییەکان کە جیهانبینیی عەقڵی پیاو داینەمۆی کارکردنیانە بەفیمینزم بچوێنن، یان خۆیان بەخۆیان بڵێن بزووتنەوەی فیمینستین.

## فیمینزم و ئەنتی فیمینزم

زۆر هێزی دژ بەژن و هەندێ لە بزووتنەوەکانی ژنانیش بە(ئەنتی فیمینزم) خۆیان ناوزەد دەکەن، ئەوان پێیان وایە بزووتنەوەی ئافرەت - ژنان و بزووتنەوەی فیمینستی جیاوازە و بۆ داواکاری و مافی ژن و مەشروعییەت با بناسرێن داوکارییەکانیان پێویستە دژی فیمنیست بن و بەئەنتی فیمینزم Unti - Feminism، ئەو بۆچوونەش ڕاستە، چونکە Womanism

و مەینیزم جیاوازە لە فیمینزم Feminism یەکەمیان زیاتر جەخت لەسەر ژنیەتی و دووەم لەسەر مێیەتی دەکات کە یەکەمیان رادیکاڵییە و دووەمیان لیبرالی. هەروەها بەپێی بۆچوونەکانیان بزووتنەوەی ژنان کە لە کۆتاییی سەدەی ناوەڕاستەوە دەستی پێ کردووە ئەوە بەقۆناغی یەکەم ناوزەد دەکرێت. دیارە لە کاتی جێگیرکردنی قۆناغی یەکەمیشدا وەکو ئێستای قۆناغی فیمینستی بەرهەڵستییان دەکرد و ڕەت دەکرایەوە، بەڵام ئێستا بەقۆناغی ڕاستەقینە و گونجاوی مافی ژنی دادەنێن، هەروەها پێیان وایە فیمینزم جیاوازە و ئەو بزووتنەوەیە لە ساڵی شەستەکاندا و بەدەرکەوتنی قوتابخانەی سلوکی دەرکەوتووە، ئەو ناوەش لەوەوە وەرگیراوە کە سلوک ڕاستەوخۆ پابەندیی ڕەوشتی دەگەیەنێت و لای ئەنتی فیمینزمی ئیسلامی و کۆنەپارێز پێیان وایە فیمینزم لە داواکارییەکانیاندا بۆ مافی ژن هیچ بۆشاییییەکیان بۆ داوونەریت و ڕەوشت نەهێشتووەتەوە، شۆڕشی ژنیش پاش شەستەکان شۆڕشێکی سێکسی و بزووتنەوەیەکی یاخی دژە ئاین و داوونەریت و بیروبۆچوونی کۆمەڵن لەو بوارانەدا زیادەڕۆییان هێناوەتە ئاراوە نەک تەنیا لەبوارە ئابووری و سیاسییەکاندا بگرە جیاوازیی بابەتی هەیە، بەڵام لە ڕاستیدا وەکو لەپێشەوە لەگەڵ پێناس و واتا و سەرهەڵدانی مێژووی فیمینزمدا ڕوونم کردەوە ئەوەی ئەو لەگەڵ کۆنەپارێز و بۆچوونە فیودالیزمەدا دێتەوە تەنیا بیرتاریکی و نەزانینە نەک ڕەوت و بۆچوون وەکو خۆیان ناویان ناوە سلوکی فیمینستی.

لە ڕاستیدا کۆمەڵێ جیاوازیی ڕیشەیی و بابەتی و گرینگ هەیە لەنێوان بیروبۆچوونی کارکردنی فیمینست و ئەنتی فیمینستەکاندا، ئەو جیاوازییانەش لە زۆر ڕووەوە لێک دەدرێنەوە و کۆمپریت دەکرێن وەکو:

* چۆنیەتیی ڕاڤەکردنی بارودۆخی ژن لە کۆمەڵدا و سەرچاوەی داواکارییەکانی.

* هەڵوێستی بەرامبەر بەکۆمەڵ و چۆنیەتیی مامەڵە و پێکەوەژیانی هەردوو ڕەگەز.



## شوێن و چارەسەرکردنی کێشەی ژن و گۆڕینی بارودۆخەکەی

دیارە ئەنتی فیمینزمەکان زیاتر لەگەڵ هەندێ ڕا و داواکاریی سەدەکانی ناوەڕاست ماون و خۆیان بەڕەوتی یەکەم دەزانن و بزووتنەوەی فیمینزمیش ناو دەنێن ڕەوتی دووەم وەکو گوتیشم هەندێکیان ڕەوتی یەکەم بەپێش ساڵی شەستەکان دەزانن و ڕەوتی دووەمیش کە بزووتنەوەی فیمینزمە بەپاش شەستەکان دەزانن کە ئەم بۆچوونە هەڵەیە و تەنانەت لە سەدەی ناوەڕاستیشدا ڕەوتی فیمینزم هەبووە، بەڵام وەکو دیاردەیەکی گشتگیر و بڵاوبوونەوە و لە سەردەم فەلسەفەی وجودییەت و سەرەتای سەدەی نۆزدە وەکو چمک ئەو چمکە لە ئاستێکی بەرفراواندا بەکارهێنراوە، هەر بۆیە ئەوانە ئەو بۆچوونەیان هەیە کە ڕەوتی فیمینزم زۆر نوێیە ئەوە تەنیا بۆ ڕەوینەوەی ئەو حاڵەتەیە کە ئەوان کۆنەپارێز نین و مێژوویان مێژووی ئەم سەدە و سەردەمەیە، بەڵام لە ڕاستیدا دروستبوونی ئەو ململانێیەیش لە جیاوازیی بیروبۆچوون و ناوەڕۆکی وەگەرخستنی چالاکییەکانە بۆ مافی ژن، هەروەکو لەم جیاوازییانەدا دەیبینین:

١- ڕەوتی یەکەم واتە ئەنتی فیمینزم تا ئێستاش بەیەک چاو بۆ زۆر و ستەمی پیاو لەسەر ژن دەنوارێت لە جیهاندا و پێی وایە کێشەی ژن لە جیهاندا هەمووی یەکە و هەموو لە یەک ئاستدا ژێردەست و چەوساوە و مافخوراون و پیاوسالاریش هەر لە یەک ئاستدایە لە جیهاندا.

بەڵام ڕەوتی دووەم کە فیمینزمە خوێندنەوەی زانستییانە و دروستتری هەیە بۆ کێشەکان و دەڵێ جیاوازی لە چەوساندنەوە و ژێردەستی و مافخوراویی ژن بەپێی ناوچە و هەرێم و یاسای وڵاتە جیاوازەکان جیاوازن و چەوساندنەوەی ژنان لە هەموو جیهاندا لە یەک ئاستدا نییە و هەندێ شوێن ژن تێیدا چەوساوەترە هەتا شوێنێکی تر و لە هەندێ شوێنیش شێوەی چەوساندنەوە و مافخواردنەکە جیاوازن هەتا شوێنێکی دی.

٢- ئەنتی فیمینزم پێی وایە تەنیا پیاو و سروشت ژن دەچەوسێنێتەوە.

فیمینزم لەو ڕەوشە زیاتری خستووەتە ڕوو پێی وایە ژنیش ژن دەچەوسێنێتەوە و پێویستە ڕێگریی لێ بکرێت بۆ ئەو مەبەستەش چەوساندنەوەی ژنی ڕەش لەلایەن ژنی سپییەوە خستە ڕوو.

٣- ئەنتی فیمینزم داوای بەشداریی سیاسی و ئابووریی ژن دەکات لە ئاستێکی سنووردارادا و پاشان داوای مافە پیشەییەکانی بۆ دەکات بەپێی بۆچوونی ئەو بەرامبەرانەی لایەنی بایلۆجیی ژن. بەڵام فیمینزمەکان دروشمی Personal Politicalی بەرز کردەوە و وایان دانا هەموو کەسێک سیاسەتی کەسیی خۆی هەیە لە ژیاندا و نەک ئەو سیاسەتەی ئەوان باسی دەکەن، ئەوەیان ڕەت کردەوە کە سیاسەت لە واتا نەریتییەکەیدا بمێنێتەوە و داوای بەشداریی ژنیان کرد لە سەرجەم دام و دەزگا و پیشە جیاوازەکاندا لە دەزگای خێزانەوە هەتا سەرکردایەتیی وڵات.

٤- ئەنتی فیمینزم داوای مافی ئابووریی ژن لە ڕووی سیاسی و بارودۆخی سیاسییەوە دەکات، چ فیمینزمیشە داوای مافی ئابووریی تەواو لەگەڵیدا مەعنەویش بۆ ژن دەکات.

٥- ڕەوتی یەکەم (ئەنتی فیمینزم) منداڵ بەسەرچاوەی ژیان دادەنێ و لەباربردن ڕەت دەکاتەوە.

فیمینزمەکان پێیان وایە ژن خاوەنی جەستەی خۆیەتی تەنیا خۆشی بۆی هەیە بڕیاری لەسەر بدات مافی لەباربردنی بۆ ژن دەستەبەر کرد، لێرەشەوە بوو سیموون دی بوڤوار ناوی ناوە (کۆیلایەتیی خستنەوە) و داوای ئازادیی دایک و لەباربردنی و هاوسەرایەتیی کرد (ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە بزووتنەوەی فیمینستی زۆر بەر لە ساڵانی شەستەکاندا دەرکەوتووە).

٦- ڕەوتی یەکەم بۆ کاروباری سەربازی و زۆر کاری تر کە تەنیا پیاو پاوانی کردبوو بۆ ژن بقە و عەیب بوو، بیانووی بایلۆجیی بۆ دۆزیبوەتەوە گوایە ژن ناتوانێت بیکات.

فیمینزم بەهیچ شێوەیەک باوەڕی بەهیچ جیاوازی و بەربەستێکی



بایلۆجی و کۆمەڵایەتی نییە بۆ کارکردنی ژن.

٧- ئەنتی فیمینستەکان لە یەکسانی و بەرابەریی تەواو ترس و دڵەڕاوکێیان هەیە بەرامبەر بەوەرگرتنی سەرجەم مافەکانی ئەو ترسەشیان لە نەریت و ئاینەوە سەپاندوە بەسەر خۆیاندا.

بەڵام فیمینزمەکان بێ سڵکردنەوە داوای سەرجەم مافەکانی ژن و بەرابەریی لە هەموو بوارێکدا بۆ دەکەن.

٨- ئەنتی فیمینزمەکان پێیان وایە ئەگەر داوای مافەکانیان بکەن پیاوان لێیان دەڕەنجێن و ڕەگەزەکەی تر بایەخیان پێ نادات و ئەوەش لە ژنیەتیی ئەوان کەم دەکاتەوە.

فیمینستەکان پێیان وایە کەسایەتیی ژن تەنیا خۆی هەڵگریەتی و ڕەگەزەکەی تریش هێندەی ئەم پێویستیی بەبایەخی ئەوی فیمینست هەیە، پێی وانییە هیچ شتێک و ترسێک پێویستە وا لە ژن بکات واز لە مافەڕەواکانی خۆی بهێنێت.

ئەم جۆرە جیاوازبوونە لە ڕاوبۆچوونەکانی ژناندا بەرابەر بەمەسەلە پیرۆزەکانی خۆیان بەقوربانیکردنی ڕاستی و دادپەروەری لە پێناوی نەریت و دڵی پیاودا وای کرد و پێناسەکانی فیمینزم ئاوەژوو بکرێتەوە و ئەنتی فیمینزمیش پاش ئەوەی وەئاگا هات کە فیمینزم زانستی ژنناسییە، ئەوە پاڵنەر بوو بۆ ئەوەی بڵێن ئێمەش فیمینستین بەڵام جۆرێکی تری فیمینزم و هەرکەس بەپێی قوتابخانە فیکری و کۆمەڵایەتییەکان لق لە فیمینزم بکاتەوە و، دابەش بکرێت بەسەر چەندین ڕەوتدا. ئەمەش ئاکامی خراپی بۆ سەر بزووتنەوەی فیمینزم هەبوو بەتایبەت لە ڕووی ڕەگەزپەرستییەوە.

## فیمینزم و ڕەیسیزم

کەم هۆشیاریی ژن و مرۆڤ بەگشتی بەرامبەر بەچمکەکان و زانستی تێگەیشتن بووە بەهۆی تێکەڵاوبوون و ئاوەژووکردنی پێناسەکان، کە

بەشێوەی هەرەمەکی و بێ دەربەستانە پۆلێن و پەیوەستکردنیان بەرجەستە دەکەن. مرۆڤیش وەکو ئافریدەیەکی نەسرەوت و پڕ جووڵە ناتوانێت لەسەر یەک ڕێچکە چەق ببەستێت و هەموو شتێک دەخاتە ژێر تاقیکردنەوە و ئەزموونی خۆیەوە زۆرجاریش دەچێتە دەرەوەی سنوورە سوورەکان لەپێناوی کۆنترۆڵکردنی نادیارەکاندا، ئەمەش جارێکی تر تووشی گەڕانی دەکات بەدوای پێوەندی و پەیوەستبوونی نوێدا و چونکە تەنیا پێوەندییە مێژووییەکان خواست و تێڕامان و بۆچوونەکانی تێر ناکەن، بەتایبەت کە تێڕوانینەکانی مرۆڤ سنوورێک لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا دیاری دەکات و لەنێوان ئەو سنوور و دڵەڕاوکێیانەدایە کە مرۆڤ هەوڵی داوە و دەدات پێوەندیی مرۆیی و مێژوویی و مۆراڵی لە هیچ کۆتوبەندێکی سروشت نەبەستریتەوە و یەکێک لە پنتە بەهێزەکانی مرۆڤایەتیش کە ژنە و پێویست بوو مرۆڤایەتییەکی هاوبەش و یەکسانی لەگەڵ سەرجەم مرۆڤایەتی و سروشتدا بۆ دابڕێژرێت، دیارە ڕۆژئاوا پێشتر هەستی بۆ ئەم حاڵەتە بزواوە و چووە و، جارێکی تر سەرجەم شتەکان و مرۆڤیشی داڕشتەوە، بەڵام لە هەندێ ڕووەوە ناکۆک لەگەڵ سەرجەم سروشتی مرۆڤ، ئەویش بەرجەستەکردنی هەموو شتەکان بوو لەسەر ڕیتمی مادی و پاش ئەوە ئەم ڕەوتە گورزی خۆی لە جیهانی ژن وەشاند، لە ئەوروپادا بزووتنەوەی فیمینزمی قۆستراییەوە بۆ بزووتنەوەی ڕەیسیزم ژنانە و پراکتیکی زۆر نەخۆشیی سایکۆلۆجی بەناوی خڕبوونەوە لە دەوری ژن بکرێت بەسیمای ئەو بزووتنەوەیە، بەڵام هەر ئەو دابەشکردنەی لە بەشەکانی تردا باسم کرد و کرا بەفیمینستی لیبراڵ و مارکسی و... تاد بوو بەهۆی ڕاکێشانی فیمینزم بەلای ڕەیسزمدا و زۆر کەس فیمینزم بەڕەیسزیم ناوزەد بکات و تەنانەت زۆر ژن و مرۆڤیش بەگشتی وابزانێت فیمینزم ڕاسیزمە و پرکتیکی ڕاسزمیانە بۆ ئەو زانستە هەبێت و ئەوەش بەسیمای مرۆڤی چەوساوە بزانن و تۆڵە لە چەوسێنەرەکەیان بکەنەوە، بۆ ئەو خواستەش جۆرەها چمکی نوێ و ئاکاری نوێی شیاو و نەشیاو بهێننە



ئاراوە، چونکە شارستانییەتی ڕۆژئاوا مرۆڤی تەنیا لە چوارچێوەی مادییەکەدا داڕشتووە و هەر بۆیە بزووتنەوەی فیمینزمیش لەلایەن هەندێ گرووپ و ئەنتیکەوە پاوان کرا بۆ کاری ژن لەپێناوی ژندا هەندێ جار لە دەرەوەی سروشت. ئەوان پێیان وایە ئەو بزووتنەوەیە پێویستە تەنیا کاری ژن بێت لەپێناوی ژن و خواستی ژندا نەک بەرابەریی نێوان هەردوو ڕەگەز، پێیان وایە فیمینزم تۆڵەی ساڵەهای مافخوراویی ئەوانە لە پیاو نەک ڕێکخستنی هاوکێشە چەوتەکان، بیرکردنەوەی نادروست ئەوانی برد بەرەو ڕەوتی تاکپەرستی، ئەوە لە خۆیدا یەکێک لە سیماکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی ڕۆژئاوایە، بەڵام ئەو گرووپانە لەو ڕەوتە مادییەش دەرچووە و وای کرد هیچ ڕیشەیەکی هاوبەش لەنێوان ژن و ڕەگەزەکەی تر، ژن و سروشتدا نەهێڵنەوە و وەکو ئەوەی لە بنەڕەتدا مرۆڤایەتی کۆی نەکردبوونەوە.

بزووتنەوەی فیمینستی کە لە بنەمادا داوای مافە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکانی ژن دەکات لەناو کۆمەڵدا و بۆ تێڕوانینێکی ئەنترۆبۆلۆجیی کۆمەڵایەتیی گشتگیر وەکو ڕۆڵی ژن لە مێژوو و لە ئێستادا، بەڵام ئەو گرووپانە دەیگەڕێننەوە بۆ سەرلێشێواویی ڕاسیزم و ئاماژە و ڕەمزە مێینەکانی شتەکانی بەکارهێنان واتە دیسان شتە مادییەکان کە مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت لە ژیانی ڕۆژانەدا و بەڕادەیەک زۆرجار ململانێ و مشتومڕی توند دەخولقێت لەسەر هەندێ وشەی ساکار کە گۆڕین و نەگۆڕینی هیچ لە دەرد و مەینەتییەکانی ژن کەم ناکاتەوە، ڕاستە کۆمەڵێک هەوڵ دەدەن سروشتی شتەکان بگۆڕن بۆ سروشتی مێیەتی، بەڵام بەشێوەیەک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت کە ئەمجارە ژنسالاری جێگەی پیاوسالاری بگرێتەوە و ئەوەشیان دیسان ئەو مەبەستەیان نەپێکاوە کە پێویستە ژن کاری بۆ بکات ئەویش مرۆڤایەتییەکی هاوسەنگە... بۆ نموونە گوتیان وشەی History کە لە هەردوو وشەی لێکدراوی His+stoty وەکو زانراوشە His، لە ئینگلیزیدا ئامرازێکە بۆ نێر بەکار دێت، بگۆڕدرێت بۆ

وشەی Here واتە بکرێت بەلێکدراوی Her+Story مێیەتی دەربخات و ئاماژە بۆ مێیەتی بەکار دەهێنرێت، هەروەها ژنانی ڕۆژئاوا هەژاریان مێ کرد واتە بەرگی ژنانەیان بەبەری هەژاری بڕی و کردیان بەFeminzition Of Poverty ئەم بۆچوونەشیان لەو ڕوانگەیەوە بوو کە ژیانی ژنی ڕۆژئاواوە بوو کە تەواو جیاوازە لە ژیانی ژنی ڕۆژهەڵات بەتایبەت لە مەسەلەی هاوسەرێتی و بەخێوکردنی منداڵدا، کە زۆربەی ژنی ئەوروپی لەگەڵ پیاوێکدا دەژی وەکو هاوڕێ نەک پێوەندیی هاوسەرێتی و لەو پیاوانەش منداڵیان دەبێت و پاش ماوەیەک پیاوەکە ئەگەر نەیخواست و لەسەر ژیانی هاوسەرێتی پێک نەهاتن بەجێی دەهێڵێ و لێپرسراوییەتیی بەخێوکردنی منداڵەکەش لە ئەستۆ ناگرێت و ئەمڕۆ ئەوە زەقترین ئەو کێشانەیە کە ژنی ڕۆژئاواییی پێوە دەناڵێنێت، هەر ئەو بارودۆخەیە لە هەموو کێشەکانی تر زیاتر ژنی کردووە بەکۆیلەی کارکردن و هەژاری لەگەڵ هاوکاریکردنی حکوومەتەکانیشدا، بەڵام ئەو هاوکارییە کەمە دادی ژیانی پڕ تەنگوچەڵەمە و گرانبەهای ڕۆژئاوا نادات، لەبەرئەوە پێیان وایە تەنیا ژن هەژارە و ژن ئەرکی مادیی زیاتر لە ئەستۆدایە و ئەرکی پەروەردەی منداڵی لە ئەستۆ گرتووە. هەر ئەوەش وای کردووە ژمارەیەکی زۆری ژنی ڕۆژئاوا بەڕەبەنی و تەنیایی بمێننەوە و متمانەیان بەگوزەران لەگەڵ پیاودا نەبێت، بەڵام ئەوەش دیسان کۆمەڵێ کێشەی تری کۆمەڵایەتیی لێ کەوتووەتەوە وەکو سێکسکردن لەگەڵ ئاژەڵدا ،ا ژمارەیەکی زۆری ژن و تەنانەت پیاویش دەرەنجامی ئەو متمانە نەبوون و ناجێگیرییەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ژیانی ڕۆحی و سێکسییان لەگەڵ سەگێکدا ئەنجام دەدەن، ئەوەش دیسان کێشەی نەخۆشیی بڵاوکردەوە و بوو بەهۆی بڵاوبوونەوەی زۆر ڤایرۆس و نەخۆشیی کوشندە لە ڕۆژئاوادا، لێرەوە ئەو گرووپانە پەنایان بۆ سێکسی هاوڕەگەز برد ئەوەش تەوژمی Lesbianism لیسبینزمی لێ کەوتەوە، واتە پرۆسەی ئەنجامدانی سێکس ژن لەگەڵ ژن، هەروەها مەسەلەی gay واتە جووتبوونی پیاو لەگەڵ پیاو، هەندێکیان



ئەمە بەپەرچە کرداریک دادەنێن گوایە ژن ئەگەر بەتەواوی لە چەوسێنەرەکەشی کە پیاوە دوور بکەوێتەوە ئەوا هیچ پێویست و بۆشاییەکی ڕۆحی و جەسەدی و کۆمەڵایەتیی نابێت و بەهەمان شێوە ئەو دیاردەیە لای پیاوانیش دەرکەوتوو و ئەو بۆچوونەی خۆشیان بەباوەڕێکی گرینگ و متمانە پێکراوی کۆمەڵایەتی ناوزەد دەکەن و سەندیکا و ڕێکخراوی بەرگریکردن لە خۆیان هەیە و لە زۆر وڵاتدا لەڕووی یاساییەوە ڕێگەیان پێ دراوە کە هاوسەرایەتی بکەن، واتە هاوسەرایەتیی تاک ڕەگەزی، ئەو هەڵەیە ژنانی عەرەبیش دووبارەیان کردووەتەوە بۆ نموونە دەڵێن مادام (عولمة، المدینة وانترنیت...) هتد لەبەرئەوەی کۆتاییەیان بەپیتی (ت،ة)و ئەو پیتەش لە زمانی عەرەبیدا بۆ ژن بەکاردێت پێی دەگوترێت (تاء التانیث) کەواتە ئەو دیاردانەش ژنانە و جیهان بەرەو جیهانی ژنیەتی دەچێت، دیسان لە ئەمریکادا بەڕەسمی گرووپی لیزبینیان دامەزراندووە و لە ماڵپەڕەکانی خۆیانەوە بانگهێشتنی ژنانی عەرەب دەکەن بۆ ئەندامبوون، ئەو دیاردەیەش گومانی تێدا نییە کە دیاردەیەکی کۆنە و پابەندیی بیروباوەڕ و بەڕادەیەکی زۆریش نەخۆشییە سایکۆلۆجی و جینیتییەکانی مرۆڤەوە هەیە و بەڵام پێویستە لای کۆمەڵ و ژنی کورد بەتایبەت ئەو دیاردانە هەڵاوێرن و بەتەواوی لایان ئاشکرا بێت کە ئەو دیاردانە دوورن لە ڕەوت و بیروبۆچوونی فیمینستی و ئامانجی بزووتنەوەی فیمینزم پێویستە ڕێکردنەوەی ناچیزە و نەشیاوەکان بێت بۆ شیاو ئیتر ئەو دیاردەیە بەبەرابەری مافی ژن بێت لەگەڵ پیاو یان پێچەوانە، ئەگەر لە هەرێمێک چەوسانەوەی پیاو هەبێت، یاخۆ بۆ تێگەیشتنی ژن بێت لە سروشت و دیاردە جیاوازەکان و گرینگ ئەوەیە پێویستە دادوەری و یەکسانی و بەمرۆبوونی شتەکانی لە ناخی خۆیدا هەڵگرتبێت.

### سەرچاوەکانی ئەم بەشە

١- سەرچاوە: ئافرەت لە مێژوودا... د. کەمال مەزهەر.

٢- ساس له زمانی عەرەبیدا بەواتای ڕام دێت و زیاتر بۆ ڕامکردنی ئەسپ بەکار دێت و بەپێی سەرچاوەکان وشەی سیاسەتی لێ پێک هێنراوە، هەروەها پێم وایە لە زمانی کوردیشدا سوود لەو وشەیە وەرگیراوە ئەو ڕامە کراوە بەڕامیاری واتە سیاسی... ک.س. بنواڕە بەشی سێیەم.

٣- سەرچاوە ژنی کورد لە دەروازەی هەزارەی سێیەمدا... کازیوە ساڵح.

٤- سەرچاوە مێژووی ژنی کورد... د. جەبار قادر... کلاوڕۆژنە.

٥- سەرچاوە وێناکردنی کۆمەڵ ژن لە کۆدەکانی شۆڕشی زانیاریدا... کازیوە ساڵح.

- قضية تحرير المرأة، للأستاذ محمد قطب.

- المرأة والحياة الاجتماعية. تغاريد بيضون، دار النهضة العربية بيروت.

- المؤامرة على المرأة المسلمة، د. السيد احمد فرج.

- دار الأرقم بمصر، الطبعة الثالثة، ١٤١٣هـ، ص ٢٣٩، ٢٥٢

- احذروا الأساليب الحديثة في مواجهة الإسلام، د. سعدالدين السيد.

- الحركات النسائية في الشرق وصلتها بالاستعمار. د. محمد فهمي عبدالوهاب، دار الاعتصام. مصر.

- ماذا يريدون من المرأة، عبدالسلام بسيوني

- http://womensissues.about.com/cs/antifeminist

- http://www.psr.keele.ac.uk/sseal/feminism.ht

# بەشی سێیەم

بزاڤی سیاسی لە تیۆری فیمینزمیدا
زانستی سیاسی
سیاسەت چییە؟
زانستی سیاسی لە مێژووی نوێدا
ئاستی ژنی کورد لە سیاسەتی نوێدا
ئاماری‌پۆستی‌سەرکردایەتیی ژنان لەبواری ڕامیاریدا
ژن چۆن دەتوانێت نیوەی پەرداخەکە پڕ بکات؟
پەیمانی کۆمەڵایەتی
هۆشیاری لای فیمینست
سیاسەت و زانستە جیاوازەکان
سیاسەت و زانستی سۆسیۆلۆجی
سیاسەت و زانستی سایکۆلۆجی
کاریگەریی ئابووری و ژنانی فیمینست
ئامانجی سیاسیی فیمینست
شەرعییەتی فیمینستی سیاسی

## بزاڤی سیاسی لە تیۆری فیمینزمیدا

مێژووی هەر زانستێک لە مێژووی گەڵاڵەبوونە مێتودییەکانییەوە دەست پێ دەکات. هەتا میتۆدیش ئاشکرا نەبێت، زانست بەردی ونبووی گۆمی ڕا جیاوازەکانە، ئاوێنەی باڵانومای زانست تەنیا ڕووی ڕاستەقینەی مێتودە کە لە پرسی گومانەوە و دەردەهێنێت بۆ پرسی تیۆری و پاشان پراکتیک، بۆیە ناکرێت، پرسی فیمینستی و سیاسی لای ژنی کورد بخوولقێنین بەبێ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ کورتە سەرە پێنووسی مێژووی سەرهەڵدانی(١).

## زانستی سیاسی

بە چاوخشاندن بەگۆڕانکاریی پێشکەوتنە سیاسییەکاندا بۆمان دەردەکەوێت کە سیاسەت بەرەو دەسەڵاتخوازی ڕۆیشتووە، ئەوە دەکرێت بڵێین شارستانییەتی کۆنی یۆنانی داهێنەری چمکی زانستی سیاسییە، لە ڕاڤەکردنی زانستی سیاسیدا ڕاستەوخۆ ناوی سوکرات و ئەفلاتون و ئەرەستۆ دەکەوێتە نێو چوارچێوەی بیرمان، کە ئەو سێیانە بەبناغەدانەری فەلسەفە پانتاییی مێژوویان گرتووە. زانست و فەلسەفەش دوو چمکی هاوبەشن. سوکرات ٣٩٩ پ.ز. بەبونیادنەری فەلسەفە دادەنرێت لەگەڵ ئەوەی یەک وشەی نەنووسیوە، ئەوەی کە زانراوە دەربارەی تیۆرییە فەلسەفەکانی تەنیا لە ڕێگەی قوتابییەکانی گەیشتوون بەخەڵک، کە دیارترینیان ئەفلاتون بوو. ئەو مرۆڤەی شەهیدی فەلسەفە بوو چونکە پەرچەکردار و پاشەکشەی لە حەقیقەت پێ نەنگی بوو تا گەیشت بەوەی لە ساڵی ٣٩٩ پ. ز لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا تیۆرییەکانی بەو هاوڕێ و قوتابییانە بەخشی کە بەر لە مەرگی شاریان بەجێ هێشت.

ئەفلاتون ٣٢٧-٣٤٧ پ.ز یەکەم فەیلەسووفە کە کارەکانیمان بەتەواوەتی دەگاتە دەست و لەوانە (کۆمار، ڕامیاری، گفتوگۆی یاساکان)



کە تێیدا زۆربەی زانستە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی بەرجەستە کردووە، جگە لە تیۆرییە فەلسەفییەکانی سەبارەت بەمردن و نەمری پاش مردن و سروشتی عەقڵ. لەگەڵ ئەوەی تیۆرییەکانی ئەفلاتون بەراورد بەسیاسەت و تیۆریی سیاسیی ئێستا زیاتر لە یوتوپیادا خۆی دەبینێتەوە، چونکە ئەفلاتون کۆمەڵێ ڕاستی دەگرێتەوە، ئەو ڕاستییانەش لە جیهانی سیاسیی ئەمڕۆدا جێگەیان نابێتەوە، لە سەردەمی خۆشیدا بەتیۆری نموونەیی ناوزەد کراوە، مەحاڵیشە نموونەیی لەنێو دووڕیانە تاریکەکانی سیاسەتدا هەڵ بکات چونکە تیۆرییەکانی ئەفلاتون لەسەر ئەم ڕاستییانە پێک هێنرابوون.

١- چاکەخوازی پەیکەری دەوڵەتە.

٢- بنەمای چاکەخوازیش پەروەردە و فێربوونە.

٣- دادوەری سیفەتی بنەمایی فەرمانڕەوایە.

٤- پێشخستنی بەرژەوەندیی کۆمەڵ بەر لە بەرژەوەندیی تاک.

٥- حوکمکردن هونەرێکە پێویستی بەشارەزایانی ڕاهێنراو هەیە(٢).

فەلسەفە عیشقە بۆ زانست و بەر لە هەموو شتێکیش هەڵویستی مرۆڤە بەرامبەر ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان، دیارە مەبەست لەو جۆرە هەڵوێستەیە کە لە تیۆریی فەیلەسوفەکاندا ڕاڤەکراوە، وەکو ئەو هەڵوێستەی (کامی) دەربارەی مرۆڤی یاخی دەیخاتە ڕوو وەکو هەڵوێستی سوکرات ئەو مرۆڤە بوو کە بەتۆمەتی تێکدانی خووی لاوانی ئەسینا کرایە بەندیخانەوە و قوتابییەکانی لێی پاڕانەوە کە ڕا بکات و ڕۆحی ڕزگار بکات لە مردن، ئەو ئەوەی نەکرد و بەڵێشی نەکرد بۆ نەیارانی بیروباوەڕی، لە بەردەمی ئەواندا ژەهری خواردەوە و گیانی سپارد بەبیروباوەڕی خۆی بەویژدانێکی ڕازییەوە. بۆیە فەلسەفەی سیاسی جیاوازە لەگەڵ سیاسەتی پراکتیکی، بۆیە نامەوێت بچمە سەر فەلسەفەی سیاسی، چونکە فەلسەفەی سیاسی ئەو سیاسەتە تیۆرییەیە کە بایەخ

بەدیاردە سیاسییەکانی پابەند بەبارودۆخی دەوڵەت و حکوومەت دەدات و جیاوازە لەگەڵ دیاردە ئابووری و رۆشنبیری و دادوەری و بەڕێوەبردن و بارودۆخی خەڵک، جیاوازە لە سیاسەتی پراکتیکی کە واتای پرۆسەی سیاسی دەگرێتەوە لە فەرمانڕەواییکردن و بارودۆخی خەڵک و بەرژەوەندییەکانیان دەکۆڵێتەوە، جگە لەوانەی باسمان کرد (تۆماس هۆبز) دەربارەی سیاسەت دواوە (التنینا و لفیاتان) باس لە زۆرداری و سەرچاوەکانی دەکات کە لە ئامادەباشیی سروشتی مرۆڤ کۆتایی دێت ببێت بەگورگ بۆ مرۆڤەکانی دی. مۆنتسکۆش ١٦٨٩-١٧٥٥ لە (روح الشرائع)دا بەوردی ڕاڤەی تیۆرییەکەی خۆی دەکات سەبارەت بەفەرمانڕەواییکردن کە بەکۆماری و مەلیکی و زۆرداری پۆلێنی کردوون. جگە لە زانایانی فەڕەنسیی بواری یاسا لە پێشکەوتنی زانستی سیاسیدا. بەڵام ڕاڤەکردنی ئەو چمک و پێتانە لە دەرەوەی سروشتی ژن و هێز و توانای نەکراوە ٢٥ سەدەی بەر لە ئێستا سوکرات داوای یەکسانیی کردووە، بەڵام گوێی لێ نەگیراوە و هەتا لە زمانی ئەفلاتونی قوتابییەوە گەیشت بەخەڵک کە سوکرات گوتوویەتی: (پێویستە ژنیش وەکو پیاو بەتەواوەتی پەروەردە بکرێت و ڕابهێنرێ چونکە ژنیش وەکو پیاو دەتوانێت مۆسیقا و وەرزش بەرجەستە بکات، بەپێی پێویستی توانای هەموو کارێکی تیادا هەیە)(٣).

واتە لە سەرەتای دۆزینەوەی فەلسەفە و هۆشیارییەوە، درک بەپێویستیی یەکسانی کراوە و ئاماژەی پێ کراوە، بەڵام وەکو تیۆرییەکی سەربەخۆ کاری بۆ نەکراوە. تەنانەت بەدەرکەوتنی تیۆرییە سیاسییەکانی ئەرەستۆش ١٥٠٥-١٥٦٤ پ.ز کە یەکێک بوو لە گەورەترین بیریارە سیاسییەکانی یۆنان تا ئێستا مرۆڤایەتی ناسیوویەتی. ژن درکی بەپێویستیی چالاکی سیاسی نەکرد وەکو پێناسە و دەستەبەرکردنی کەسایەتیی سەربەخۆ. ئەرەستۆ بەم شێوەیە مرۆڤ بەسیاسەتەوە دەبەستێتەوە.



(مرۆڤ ئاژەڵێکی سیاسییە. ئەو مرۆڤەش بێ دەوڵەت دەژیت مرۆڤی کوێلە و ئاژەڵە). مەبەست لە ئاژەڵی سیاسیش ئاژەڵی سیڤیلە نەک کۆمەڵایەتی چونکە بەتەنیا مرۆڤ دەتوانێت سیاسی و سیڤیل بێت. کەواتە ئەرەستۆ دەسەڵات و سیاسەت گرێ دەدات بەدەوڵەتەوە. مرۆڤی بێ دەوڵەت بەئاژەڵ و کوێلە دەزانێت، بەم پێوەرە مرۆڤی کورد لە سەرەتای مێژوویدا نەبێت کە خاوەنی سەروەری و دەوڵەتی خۆی بووە ئیتر مافی ئەوەی نەبووە بەشداریی بواری سیاسەت بکات، چونکە مرۆڤی بێ دەسەڵات و کوێڵە ئاژەڵ بووە بەپێی تیۆرییەکەی ئەرەستۆ، هەر ئەو تیۆرییە لای ئەسپینۆزا بەم شێوەیە گوزارشتی لێ دەکرێت و پێی وایە ئامانجی دەوڵەت تەنیا لە پشتگیریکردنی تاکەکەس و کورت دەبێتەوە، تاکو بتوانێت بەئازادییەوە ڕۆح و جەستەی بەهاوکاری عەقڵێکی ڕۆشنگەرانە پەروەردە بکات، ئەمەش حەقیقەتە و مرۆڤ لە چوارچێوەی سەروەریی خود وەک تاک و پاشان سەروەریی کۆمەڵ کە لە چوارچێوەی دەوڵەتدا ئاقار دەگرێت، پێناس دەکرێت، بەڵام ئەو نەهامەتییە تەنیا یەخەی هۆشیاری و کردەی مرۆڤی کوردی نەگرتووەتەوە بگرە سەرەتای مێژووی سیاسی بەگشتی سەرەتایەکی پڕ بشێوی و ناجێگیر و بێ دەربەستە بەرامبەر بەمافی زۆر چین و توێژ لەوانە توێژی ژنان و توێژەکانی خوارەوە واتە توێژە هەژارەکان، توێژە نامۆکان، واتا ئەوانەی خەڵکی ناتیڤی ئەو وڵاتە نەبووبن جێگایان لەبواری سیاسیی ئەو وڵاتەدا نەبووە گەرچی ئەو تیۆرییە شۆڤێنییە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە.

ڕاستە بەگۆڕانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیریی هەر ناوچە و وڵاتێک شێوازی پیادەکردنی دەسەڵات گۆڕاوە، بەڵام هەمیشە میتۆدی سیاسی تەنیا وەک تیۆری باسی لە توانای ژن کردووە و وەکو پراکتیک بەردەوام تورهەڵدانی ژنی بۆ دەرەوەی مێژووی خۆی هەڵبژاردووە، لە کاتێکدا کە سەرچاوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە بەر لە دۆزینەوەی زانستی سیاسی کە بەرۆشنبیریی کلاسیکیی یۆنان ناسراوە بە ٢٥ سەدە بەر لەوە

مێژووی نووسین دۆزراوەتەوە کە ئاماژەیە بەمەعریفە، مەعریفەش واتا هەبوونی هۆشیاری و درککردن بەچوارچێوەی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکان لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمی فەرمانڕەواییەتیی ژنان بەسەردەمی نەزانین و تاریکی ناوزەت کراوە(٤).

لە مێژووی کۆندا تەنیا ناوی کیلۆپاترا وەکو فەرمانڕەوایەکی بەهێز و توانا دێتە بازنەی مێژوو. ئیتر پاش هەرەسهێنانی مێژووی دەسەڵاتی ژن و سەرهەڵدانی هەژموونی باڵادەستی سیستەمی باوکسالاری هیچ ژنێک نەچووە ئاستی دەسەڵاتی بەرز، هەتا بۆ یەکەمجار خاتوو (کۆلۆنتای) بووە بەیەکەم وەزیری ژن لە جیهاندا و تا ساڵی ١٩١٨ لە پۆستەکەیدا مایەوە(٥).

**سیاسەت چییە؟**

فەرهەنگی لیترە لە ساڵی ١٨٧٠ی ز بەم شێوەیە دەربارەی سیاسەت دەدوێ:

(زانستی سیاسی زانستی حوکمکردنە). فەرهەنگی دوبیریش ١٩٦٣ دەڵێت: (سیاسەت زانستی حوکمکردنی کۆمەڵە مرۆییەکانە). ئەم دوو پێناسەیەش یەک واتا و ناوەڕۆکی هەیە هەر بۆیە (دوفرجیە) لە نێوان ئەم دوو پێناسەیەدا بەم شێوەیە ڕای خۆی دەردەبڕێت: (نزیکیی ئەو دوو پێناسەیە کە سەدەیەک نێوانیانە شتێکی گرینگە، بەڵام پێناسی نوێ فەرمانڕەواییەتیی دەوڵەت و فەرمانڕەواییەتیی کۆمەڵگا مرۆییەکانی تریش دەگرێتەوە، وشەی حوکمیش واتە لە نێو هەموو گرووپێ لە گرووپەکان دەسەڵاتێکی سیستماتیزەکراو، داوودەزگا و سەرکردایەتی و زۆر بۆ هێنان هەیە). (مدخل الی علم السیاسة).

سادق شیرازیش دەڵێت: (سیاسەت چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی خەڵکە لە شەڕ و ئاشتی، بەخشین و لێوەرگرتن و دژواری و نەواییە کۆمەڵایەتییەکاندا).



لە هەر چوار پێناسەکەدا و لە سەرجەم دید و بۆچوونەکانی مێژووی سەرهەڵدانی کۆن و نوێدا ئەو ڕاستییە دەردەخەن و هەمووان لەسەر ئەوە کۆکن کە مەبەست لە سیاسەت تەنیا بەڕێوەبردنی خود و بەڕێوەبردنی کۆمەڵێک بۆ کاروباری کۆمەڵێکی تر نییە، بگرە پێویستە ئامۆژگاری و ئامادەییی ژیان و دەسەڵاتی مەعنەوی بێت بەر لەوەی ئامرازەکانی دەسەڵاتی حەقیقی بەکار بهێنێت، جگە لە هەبوونی مەعریفە و عەقڵێکی پەسند بۆ پرۆسەی سەرکردایەتی کردن بۆ چاکەخوازی و پێشخستن بەر لە هەنگاونان بۆ پراکتیزەکردنی دەسەڵاتخوازی و سیاسەتخوازی.

لە دەروازەیەک بۆ زانستی سیاسیدا وا هاتووە کە وشەی سیاسەت لە (السیس)ەوە هاتووە کە واتای ماڵیکردن و ڕامکردنی ئەسپ دەکات، ئەم پێناسەیە لە سەرجەم پێناسەکانی تر زیاتر من ڕازی دەکات و زیاتر باوەڕم پێیەتی و وای بۆ دەچم کە وشەی ڕامیاریش کە لە کوردیدا بەکار دەهێنرێت هەر لەو وشەیەوە هاتبێت، واتە لە وشەی ڕامکردنەوە هاتووە و ڕامیاری نوێش بەهەموو خەسڵەت و کۆدەکانییەوە ڕامکردنی لە زاکیرەی مرۆڤدا تۆمار دەکات.

ناچمە سەر ڕایەکانی هیگل و سپینوزا و ئەرەستۆ مەنتیسکیو، دیکارت و جارێکی دیش سوکرات و ئەرەستۆ و ئەفلاتون، چونکە سەرجەم پێناسەکانی جیهان سەبارەت بەسیاسەت لە بۆتەی سیاسەتی جەنگەڵی ئەم سەردەمەدا تواونەتەوە، وەکو ئاماژەم بۆ کرد تەنیا بووە بەسیاسەتی ڕامکردنی مرۆڤەکان، لە ٣٥ ساڵی ڕابردووەوە گۆڕانی ڕیشەییی نێگەتیڤ لەو مەسەلەیەدا لە سەرتاپای جیهان ڕووی دا چ لە ئاستی ڕێژیمی سیاسی و سیستمی فەرمانڕەوایی کردن بێت تاکو ئەوەی لە هەندێ کۆمەڵگا ڕێژیمە دەسەڵاتدار و سیاسی و ئاینی و دیکتاتۆرەکان چوونەوە یەک و لە هەمان کاتدا هەر هەمان سیستەم لە هەندێ شوێنی تر کە گەشەی نەکردبوو بەدەستێکی ئەفسووناوی ژێر بەژێر گەشەی پێ کرد، چ لە ئاستی ئەو بانگەشە گەورەی ئەمڕۆ لە جیهاندا بۆ دیموکراسییەت دەکرێت، هەتا ئێستا

تەنیا یەک تەوەری تا ڕادەیەک هاتووەتە دی و بەواتای دیموکراسییەت سەرکەوتنیان تێدا بەدەست هێناوە بەرامبەر بەمرۆڤی ڕۆژهەڵاتی ئەویش گۆڕینی بابەتی ڕەعییەتە (subject بۆ هاووڵاتی citizens)(٦)، جگە لە پابەندبوونیان بەلۆجیکی خوێندنی بەکۆمەڵ لە پێناوی بەرژەوەندییی گشتیدا، ئەو فاکتەرانەش کاریگەریی کردە سەر پرۆسەی گۆڕان لە ڕۆژهەڵاتدا لە لایەکی تر ترسی لە لای دەسەڵاتداران دروست کرد، یەک: بەناشیرینکردن و تاوانبارکردنیان لای ڕای گشتی و دەرەوە. دوو: بە لە دەستدانی کۆمەڵێکی زۆر هاووڵاتی. هەمیشە ئەوجۆرە کارانەش دەرگا دەخاتە سەرپشت بۆ بەشداریی ژن بەڵام هەموو کاتێک یەک ئاراستەی نییە بەتایبەت سیاسەتی ئەم چەند ساڵەی دوایی. لە ئێستادا ئەو نرخەی ژن هەیبوو لە هەیبەتی سیاسیدا لێی وەرگرتووە بەبێ ئەوەی هەست بەخۆی بکات. دەتوانم هۆکاریش بۆ ئەو پۆلێن و پێناسە نوێیە بگەڕێنمەوە بۆ ئەوەی ئەمڕۆ زانستی سیاسی خۆی تێدا پێشنیار کردووە کە زانستی ڕاڤەکردن و پیاهەڵدان و دیدەنی و سازشە بۆ دەوڵەت و دەسەڵات کە دیارە ئەو فاکتەرانە و ئەو زانستەش لەسەر بنەمای فراوانی زانستی کۆڵەکەی خۆی دەچەقێنێتە زەوی واقیعی سیاسی تاڵ، لێرەوە دەڵێین ئەوەی خاوەنی زانیاری بێت دەسەڵات وەدەست دەهێنێت، کە دیارە بۆ وڵاتە هەژار فیکری و عەقڵی و زانستی و زانیارییەکان مایەی لەدەستچوونی یەک و گرتنە دەستی سفرە.

دەتوانم وای مەزەندە بکەم کە هەر ئەو ڕاستییە زانیارییانەشە وای کرد ژن لە ئەوروپا و لە گەورە زلهێزێکی وەکو ئەمریکاشدا بەپێی پێویست نەتوانێت بچێتە نێو بوارەکانی سیاسەت و بەتایبەت سەنتەری بڕیاردان ئەوانەش لەو سەنگەرەدا و گەیشتوون بەسەرکردایەتیی ئامرازی جێبەجێکاری فەرمانی نێر بوون و سووکایەتیی نێرانەیان پێ بکرێت لەوانە کە بەمارگرێت تاتچەر دەوترێت تەنیا پیاوەکەی حکوومەت، بەئۆلبرایت دەوترا نێرە بازوو ئاسنینەکە، بەڕایسی دەمڕاستی جۆرج



بوشیش دەوترێت پۆلیس مەن واتە پۆلیسی پیاو، هەر یەک لەو سیفەتانە بۆ خۆی ئاشکراکردنی بێ نرخیی کاری ژن لە دووتوێی گرتووە، لە لایەکیش دەکرێت ژنان ئەو ناوانەیان لێ نابن چونکە تەنیا ئامرازی جێبەجێکاری خواست و فەرمانەکانی پیاوانی دەسەڵات بوون و هیچ گۆڕانکاری و خێرێکیان بۆ ژنانی وڵاتانی خۆیان نەبووە.

سیاسەتی کوردیش لەناو ڕیزەکانی سەرکردایەتی خۆیدا ژنی هەڵاواردووە، تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە هەن ڕەعییەتەکانی حزبی خۆین، ئەوەش مانای ئەوەیە لەناو دەسەڵاتی کوردیدا ژن وەکو ڕەعییەتی سیاسی توانیویەتی بەشدار بێت نەک ڕاڤەکاری سیاسەتی ڕەسمی لە کاتێکدا نەدەبوو ژنان لەسەر حیسابی هەندێ باری کۆمەڵایەتی سەرباری کاری سیاسی کرابایە وەکو پێوەندییە کۆمەڵایەتی و چینایەتییەکان کە ئەمڕۆ لەناو دەسەڵاتە کوردییەکاندا گەرچی بانگەشەی دیموکراسییەت دەکەن پەرەپێدەر و پراکتیزەکاری ئەو نەریتە دواکەوتووەن. بەهەمان شێوە ئەو ژنانەش خاوەنی گوتاری ژنانە نین.

هەتا ژنان بەهۆش و بیر و توانای خۆیان، ڕیشالیزمیانە (Rationalism)(٧) یەک گوتاری تێکەڵاوی کاری سیاسی ڕەسمی نەبن لەوێشەوە لە هەوڵی بەرفراوانکردنی ڕیسای ژنانە و گوتاری ژنانە نەبن بارودۆخی ژن لە ئێستا باشتر نابێت، چونکە تەنانەت ئەگەر بچنە نێو سەنتەرەکانی بڕیاردانیشەوە بەبێ هەبوونی ئەو فاکتەرانە تەنیا (ژنە پیاو) دەبن نەک ژنی ژن و ژنناس، ژنانی ڕۆژئاواش هەمان هەڵەیان کرد هەر بۆیەش هەتا ئێستاش داوای سیاسیی ژن یەکێکە لە سەرەکیترین داواکانی و لەگەڵ ئەوەشدا تا هەنوکە جێبەجێ نەکراوە بەتێبینیی ئەوەی یەکێکە لەو داوایانەی کە نەتەوەیەکگرتووەکان لە هەموو داوایەکی تر زیاتر پێی لەسەر دادەگرێت...

## زانستی سیاسی لە مێژووی نوێدا

دەتوانین بڵێین کتێبی (ئەمیر) کە لە ساڵی ١٥١٣ نووسراوە لە لایەن زانای سیاسی ئیتاڵی میکیاڤیلی نیکۆلۆ یەکێکە لە ژێدەرە باوەڕ پێ هێنراو و سوود لێ وەرگیراوەکانی سیاسەتی نوێی جیهان. میکاڤیلی تەنگوچەڵەمە و تەنگژەکانی دەسەڵات و سیاسەتی بەشێوەیەکی زبر و لۆجیکێکی توندوتیژ خستە ڕوو... سیاسەتی میکیاڤیلی مرۆڤ فێری ڕۆشنبیریی سیاسی و توندوتیژی و بەکارهێنانی هێز دەکات پێچەوانەی ئاراستەکانی ئەفلاتون کە چاکەخوازی بەمەعریفە و بەلوتکە گەیاندنی دەوڵەت دادەنا.

بەو شێوەیە میکیاڤیلی بونیادی زانستی سیاسیی نوێ دەوروژێنێ بەناواخێنکردنی زانستی دەروونی و پەروەردە، هەر ئەو فاکتەرانەش دەکات بەپاڵپشتی (ئەمیر)ی زاڵم و توندوتیژ کە پێی وایە (هەموو ڕێگەیەک ڕەوایە بۆ گەیشتن بەئامانج) ئەویش واتای نووچدانی هەردوو چمکی کۆمەڵایەتی و شارستانییەت دەگەیەنێت، نووچدانی ئەو دوو چمکەش واتای لێکترازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی دەکات لەپێناوی بەدیهێنانی خوددا (الذات) کە دەکرێ لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بگەڕێمەوە سەری.

بەدەرکەوتنی تیۆرییەکانی میکیاڤیلی و وروژاندنە سیاسییەکانی ئەو سەردەمیش، بەردی سەنگینی ژن لەبواری ڕامیاریدا لە جێی خۆی نەجووڵا و هێندەی بەحەپەساوی بەدیار دیاردە نوێیەکانەوە مایەوە، هێندە لە بارودۆخی خۆی ڕانەما، چونکە لە بنەمادا لە سەدەی ١٤ و هەتا سەرەتای سەدەی پازدەش دەرئەنجامی ململانێی نێوان کڵێسا و حاکمەکانی ئەو سەردەمە ئەو دەسەڵاتەش ژن پێشتر بەدەستی هێنابوو ڕووبەڕووی هەرەسهێنان بووەوە. جگە لەوەی من پێم وایە تیۆرییەکانی میکاڤیلی هێندە تیۆرییێکی مرۆیی نین تاکو ڕەچاوی ماف و ئەرکی سەرجەم چین و



توێژەکان بکەن. بۆیە سەبارەت بەژن لە بەردەکەی سیزەر دەچوو ئەگەرچی بشبرایەتە سەرەوە خلۆر دەبووە بۆ خوارەوە، ئەو بارودۆخە چەق بەستووەش هەتا کۆتایی سەدەی ١٧ و لە ٣ی جانیوەری دەرکەوتنی یەکەم ژنە فیمینست ماری وڵستون (Mary Wollstone). یەکەم ژنە باسی لە تیۆری فیمینست کردووە و بەرگری لە مافی ژن کردووە، یەکێک بوو لەوانەی بەڕاستی فیکری فیمینستی کۆنترۆڵ کردبوو، چ بەڕوونکردنەوە و لێدوان چ بەکردەوە[٨].

پاش ئەویش (جان دۆران)[٩] دەستی پێ کرد، دۆران یەکەم ژن بوو ساڵی ١٨٤٩ بانگهێشتنی مافی ژنی کرد و خۆی پاڵاوت بۆ هەڵبژاردن لە کاتێکدا دەیزانی ئەو هەنگاوەی ناویەتی نایاساییە، بەڵام ئەو وای دەبینی کە بۆنەیەکی گونجاوە بۆ ئەوەی لەو کۆبوونەوە ئینتخابییەدا وەکو هەلێکی باش بیقۆزێتەوە بۆ ئەوەی وتارێکی سەبارەت بەمافەکانی ژن تێدا بخوێنێتەوە، هەر ئەویش سکاڵانامەی ژنانی نووسی بۆ حکومەتەکانی ئەو سەردەمە.

سوزان ئەنتۆنیش[١٠] (B Susan .Anthony) (١٨٢٠-١٩٠٦) یەکێک بوو لە فیمینستە لێهاتووە ئەمریکییەکان کە لەو سەردەمەدا توانیویەتی بۆ مافی وەدەستهێنانی دەنگدانی ژنان تێ بکۆشێ، جگە لە خەباتکردنی دژی کۆیلایەتی و ئازادیی کۆیلە، ئەم خاتوونە یەکەم فیمینستە وەکو ڕێزلێنان پاش مردنی وێنەی خرایە سەر دۆلاری ئەمریکی، بەڵام بەرلەوەی خەونە گەورەکەی کە مافی دەنگدانی ژن بوو بە حەوت ڕۆژ بەر لە وەدیهێنانی ئەو خەونە و لە ڕۆژی ١٣ی مارسی ١٩٠٦ ڕۆحی بەخاک و ناوی بەنەمری بەخشی. ئیمەلین پارخۆرست[١١] (Emmeelin Pankhu rst) (١٨٥٨-١٩٢٨) یەکێک بوو لە هاوڕێیانی سوزان ئەنتۆنی کە لە بەریتانیا دەستی کرد بەخەباتی فیمینستی و یەکێک بوو لە چاکسازانی شۆڕشی ژنان و مانگرتنی برسییەکان و تەقینەوەکانی ناو بەریتانیا، کۆمەڵەی ژنانی لە ساڵی ١٩٨٩ دامەزراند پاش دامەزراندنی

ڕێکخراوەکە بەچەند ساڵێک توانیی مافی دەنگدان بۆ ژنانی بەریتانیا مسۆگەر بکات، چەندین جار گیراوە و لەپێناوی ئامانجەکانی مانی گرتووە، لە ساڵی ١٩١٤ دژی جەنگی شەڕی جیهانی وەستاوە لە هەمان ساڵدا یاداشتەکانی خۆی بڵاوکردووەتەوە. خاوەنی چەندین هەڵوێستی مێژوویییە هەتا ڕۆژی ١٤ی جوونی ١٩٢٨ مەرگ لەو خەباتەی دابڕی. پاشان سارۆژینی ئاید[١٢] (١٩٧٩-١٩٤٩) نووسەرێکی هیندییە و لەنێوان هیندوستان و بەریتانیادا ژیاوە. ئاید لەگەڵ ئەوەی لە خێزانێکی بوورجوازی بووە کە ئازادییە خودییەکانی خۆی تێدا فەراهەم هێنابوو، بەڵام هۆشیارییەکەی پاڵنەری ئەوە بووە درک بەچەوساندنەوە و ژێردەستەییی ڕەگەزەکەی خۆی بکات و ببێت بەسەرکردەیەکی بەتوانای بزووتنەوەی فیمینستی، یەکێک بوو لەوانەی کاریگەریی پۆزەتیڤی لەسەر بڕیارەکانی گاندی هەبوو. بەڕادەیەک لە ساڵی ١٩٢٠ بوو بەنوێنەری گاندی لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا.

ئەم ژنە وەکو یەکەم ژنە هیندی ساڵی ١٩٢٥ وەکو سەرۆکی کۆنگرێسی هیندوستان هەڵبژێردرا، دەتوانم بڵێم ئاید یەکێک بووە لە بەتواناترین ئەو ژنانەی هاتنە بواری سیاسی لەو سەدەیەدا و کاریگەریی پراکتیکی گەورەی بەسەر ژنانەوە بەجێ هێشت و بوو بەئەزموونێکی نموونەیی کە دەکرێت زۆرێک لەو توانایەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو حیکمەت و عەقڵانییەتەی کە گاندی فەرمانڕەواییی پێ دەکرد لەو سەردەمەدا. پاش ئەویش خاتوو ئێما گۆڵدمەن[١٣] (Emma Goldman) (١٨٦٩-١٩٤٠) یەکێک لەو ئافرەتانەی بەئەنارکیسم (الفوضوي) واتە ئاژاوەگێڕ ناسرابوو کە لە ساڵی ١٨٨٥ بوو بەسەرکردەی بزووتنەوەی ئانارکیسمەکان و چەندین جار بەتۆمەتی ئاژاوەگێڕی دەگیرێت و ئازاد دەکرێت، هەروەها ڕۆژنامەیەک بۆ هەمان مەبەست بەناوی (مادرلەند) دەردەکات. هەڵوێستی ئاشتیخوازنەی دژی جەنگی جیهانی یەکەم مەدالیای جوانی ڕووی خاتوونی بەئاژاوەگێڕ ناوزەد کراوە، لەسەر ئەو شێوە کارکردنە ماوەتەوە هەتا ساڵی ١٩١٧



بەتۆمەتی دژایەتیکردنی یاسا زیندانی دەکرێت. پاش دوو ساڵ ئازاد دەکرێت و لە ئەمریکا وەدەردەنرێت بەرەو سۆڤیەت. لەوێش شێوەی حوکمڕانییەکان و شێوەی مافەکانی ژنی لا ئاشکرا دەبێت دەست دەکات بەڕەخنەگرتن لە سۆڤیەتیش، ئەوانیش دیسان دەری دەکەن بۆیە ڕوو دەکاتە بەریتانیا لەوێ بەهەمان شێوە درێژە بەبیروباوەڕی خۆی دەدات هەتا ساڵی ١٩٤٠ مەرگ لەو بیروباوەڕەی دەکات.

بارودۆخی سیاسی و هەوڵەکانی ژنان لە هەڵزنان و نووشوستیدا بووە هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە کە زانستی سیاسی بەرگێکی نوێتری پۆشی. جارێکی تر لە کۆتایی چلەکان و لە سەرەتای پەنجاکان و پاش شەڕی جیهانی دووەم مێژووی لە دایکبوونی سیاسەتێکی نوێتر درا، پاڵنەری ئەو چمکە نوێیەش دەزگاکانی یونسکۆ بوون کە بۆ ئەو مەبەستە دامەزرابوون بپن بەهاندەر و پێشخەری ئەو زانستە، هەر ئەوانیش بوون بەهۆی دامەزراندنی (کۆمەڵەی نێودەوڵەتی بۆ زانستی سیاسی) کە یەکەم کۆنگرەی خۆیان لە ساڵی ١٩٤٩دا بەست.

لێرەوە زانستی سیاسی بەهەوڵی یونسکۆ و ئەو کۆمەڵەیە چووە نێو میتۆدی خوێندن و دامەزراندنی بەشی تایبەت و تیۆری تایبەت بەو زانستە لە زانکۆکانی ئەمریکا و ئەوروپادا تا گەیشتن بەوەی بەهەزاران بیریار و لێهاتووانی بواری زانستی سیاسی و مرۆڤایەتی لەو بەشانەوە بڕوانامەی بەرزیان بەدەست هێنابوو، لێرەوەش ژنانیش وەکو ڕەگەزەکەی تر ڕووی کردە ئەو بوارە و سەدانیان بوون بەخاوەنی بڕوانامەی بەرز و چوونە سەنتەری بڕیاردانی سیاسییەوە، هەر لەو ساڵانەدا بوو کە بزووتنەوەی فیمینستی بەهۆش و بیری جیاواز پەیڕەو و بیری خۆیان ئاشکرا کرد و بوون بەسەمبول بۆ لە دایکبوونی سەدەیەکی گەشەدار و بەرەو پێشچوو سەبارەت بەمافەکانی ژنان و مافە مرۆییەکانیان، بەتایبەت کە هەر ئەو سەردەمە جاڕی گەردوونیی مافی مرۆڤ گەڵاڵە بووبوو لە بەندەکانیشدا باسی زۆرینەی مافەکانی ژنان و منداڵان کراوە و ڕەچاوی سەرجەم مافە سیاسی

و سیڤیلەکانی مرۆڤ بەگشتی کرابوو. ئەمەش بوو بەهاندەرێکی باش کە چەندین ژن بچنە چوارچێوەی خەباتی ئافرەتانە و هەندێکیشیان فیمینستانە چونکە ناتوانین هەموویان بەفیمینست ناوزەد بکەین لەبەرئەوەی فیمینستی و فیمینستخواز ڕێسا و بنەمای تایبەتی هەیە وەکو لە بەشەکانی دیدا باسمان کرد، بەڵام مێژوو نەیتوانیوە خۆی لە خەباتی ژنە فیمینستی ڕاستەقینەی فەڕەنسی (سیمۆن دی بۆڤوار) ببوێری و کۆشش و خەباتە فیمینستەکانی بۆ تۆمار نەکات، یەکێک بەلێهاتووترین ژنە فیمینست ناوزەدی نەکات و جگە لەوەی یەکێک لە داهێنەرانی چمکی فەلسەفی بوونگرایی خەباتی بێ برانەوەی سیمون بۆڤوار چەندین ژنی پەلکێشی نێو بازنەی فیکری بوڤوار کرد کەوتنە هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی مافە سیاسییەکانی خۆیان.

بەتایبەت ژنانی ئەمریکی و فەڕەنسی لەو سۆنگەیەی کە بۆڤوار ڕێژەیەکی زۆری سەرەتای دەستکردن بەخەباتی فیکری و فیمینستی لاوێتی لە ئەمریکا بەسەر بردووە یا، لەوانەش جانێت ڕەنکین[١٤] (Janet Ranken) (١٨٨٠-١٩٧٢) وەکو یاساناس و فیمینست یەکەم ژنە سیاسەتمەداری ئەمریکییە مێژوو لە ساڵی **١٩١٧** ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی ئەمریکای بۆ تۆمار کرد، لە کارەکەشیدا ئەو کاریگەرییەی هەبوو کە دەنگی داوە دژی هەڵگیرسانی شەڕ دژ بەئەڵمانیا و پشتگیری لە ئاشتی و پرۆسەی ئاشتیخوازانە کردووە. پاش جانێت، شێرل چێشۆلم[١٥] (Sherley Chisholm) **١٩٢٤** ئەویش بەهەمان شێوە یاساناسێکی ئەمریکی بوو داوای لە مافی ڕەشپێستەکان کردووە یەکەمین ژنە ڕەشپێست بووە هەڵبژێردراوە بۆ کۆنگرێسی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە ساڵی **١٩٧٢** خۆی هەڵبژارد ببێت بەسەرۆک کۆماری ئەمریکا، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. ئەم خاتوونە تا ئێستا لە ژیاندایە و پرس و ڕای سیاسی و کۆمەڵایەتی لەسەر کێشەی ژنان پێ دەکرێت.



گلۆریا ستەینەم (Gloria Steinem)[١٦] کە لە **١٩٣٤** هاتووەتە دنیا و تا ئێستا لە ژیاندایە، ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی و خەباتگێڕێکی فیمینستییە یەکێک بوو لە هاوکارانی شارلی و هاریکاری بەستنی کۆنگرەی نەتەوەییی سیاسی ژنانی کردووە، لە چەندین ڕۆژنامە و گۆڤاری سیاسیدا کاری کردووە و یەکێکە لە هاندەرانی ژنان بۆ خۆ هەڵبژاردن، ئەمانە و چەندینی تر لە ئێستادا هاتوونەتە نێو سیاسەتی ئەمریکی و ئەورووپییەوە بەڵام ئەوانەی ئێستا بەدەگمەن باس لە خەباتی فیمینستی و بیر لە ئازادییەکانی ژنان دەکەنەوە بگرە هەندێکیان وەکو تاتچر و کۆندەلیسە ڕایس ڕاوێژکاری ئاسایشی ئەمریکا لە پلانی ڕەشەکوژی و بێوەژن خستنی ژن و هەتیوکردنی منداڵانیشدا بەشداری دەکەن. ئەمە لە کاتێکدا ئاگاداری ئەو شەرمەزارییەن کە وڵاتێکی زلهێزی وەکو ئەمریکا پابەندی پەیماننامەی بنبڕکردنی سەرجەم جیاوازییەکانی ژن نییە و، زۆر لە وڵاتانیش پێشی کەوتوون لە مافی هەڵبژاردندا و لە ساڵی **١٨٩٢** نیوزیلەندا بوو بەیەکەم وڵات لە جیهاندا کە مافی هەڵبژاردنی بە ژنان دا، ئەو وڵاتانەی دیش کە پاشان پێشبڕکێی وەرگرتنی ژمارەکانیان دەکرد.

١- فینلەندا **١٩٠٦** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.
٢- ئەلبانیا **١٩٢٠** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.
٣- مەنگولیا **١٩٢٤** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.
٤- ئیکوادۆر **١٩٢٩** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.
٥- تورکیا **١٩٢٠** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.
٦- سریلانکا **١٩٢١** مافی هەڵبژاردنی ژنانی ڕاگەیاند.

هەندێک وڵاتی تر کە بەو دواییە و پاش نوێکردنەوەی بەشەکانی زانستی سیاسی لەلایەن یونیسف و دان پێدانانی مافە سیاسی و سیڤیلییەکانی ژندا لە بەندەکانی مافی مرۆڤدا مافی هەڵبژاردنی بە ژن بەخشی.

عێراق ساڵی ١٩٨٠

نامیبیا ١٩٨٩

کازاخستان ١٩٩٤

بەڵام لە سەدەی (٢١)یشدا هێشتا هەندێ وڵات دانی بەمافە سیاسییەکانی ژندا نەناوە، ژن مافی هەڵبژاردنی نییە لەو وڵاتانەش:

١- برۆنای دار السلام

٢- عەمان

٣- کوێت

٤- سعودیە

٥- ئیماراتی عەرەبی

لەو وڵاتانەی کە لەسەر پەیماننامەی نێودەوڵەتی بۆ بنبڕکردنی سەرجەم جیاوازییەکانی دژ بە ژنان مۆری نەکردووە و چەند وڵاتێکی دواکەوتووی عەرەبین لەوانە:

١- قەتەر

٢- سعودیە

٣- عەمان

٤- ئیماراتی عەرەبی

تەنیا وڵاتێکی پشەسازیی زلهێز کە بەمۆر نەکردنی ئەو پەیماننامەیە تاوانبارە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە CEDAW.

ئاشکرایە لەناو کوردستان و نەتەوەی کوردیشدا لە ساڵی ١٩٩٢ەوە یەک ساڵ پاش ڕاپەڕین و سەربەخۆیی کورد مافی هەڵبژاردن بەژنی کورد دراوە تەنیا لە ئاستی پەرلەماندا نەک سەرکردایەتی، ئەم مافەش جگە لەوەی خەڵکانی سەربەخۆ و دوور لە سیاسەتی نەگرتووەتەوە، تا ئێستا ڕێژەی ژنانی تێدا نەگەیشتووە بەدادەی یەک لە سێیان وەکو بانگەشە و خەباتی بۆ دەکەن.



## ئاستی ژنی کورد لە سیاسەتی نوێدا

بەبەراورد لەگەڵ ئەو ژنانەی لە خەباتی فیمینستیدا باسمان کرد ئەوانەشی لە دەرەوەی خەباتی فیمینستی وەکو ڕایس و ئۆلبرایت و تاتچەر، ژنی کورد لەبەرەی یەکەمیان نییە و هەتا ئێستا هزر و هۆشی خەباتی فیمینستیی لا نەورووژاوە، بگرە تەنیا وەکو بریکاری بیروبۆچوون و جیهانبینیی پیاو جیهانی پاتریاکی و وەکو بووژانەوەی (ئەو)ی باڵا کە هاوسەرەکەی یان برا و کەسەکەی کە پیاوە هاتووەتە نێو بوونی سیاسی و کەوتووەتە بەرەی دووەم.

لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەتایبەتی عێراق نەبێت لە هەموو پارچەکان زیاتر ژێر ڕکێف کەوتووی ئەو ڕێژیمە ستەمکەر و دیکتاتۆرە بووە، بەڵام کوردی ئەو دەڤەرە کەمتر لەژێر کاریگەریی قەبیلەکانی بیاباندا بوون، بگرە لەژێر کاریگەریی شاخنشینەکاندا بوون، لەبەرئەوە لە زۆر ڕووەوە ململانێی ڕۆشنبیریی جیاواز لەگەڵ ناوەڕاست و باکوری عێراقدا هەبووە. لەم ڕووەشەوە ژن لە ململانێ بێ بەش نەبووە، بەشدار بووە تێیدا. لە کاتێکدا ئافرەت لە ماوەی حوکمی عوسمانیدا ١٦٣٨-١٩١٧ تەنیا وەکو ئامێری زاوزێ تەماشا دەکرا و، لە ماوەی داگیرکردنی بەریتانیا ١٩١٧- ١٩٥٨ هەرچەندە ڕۆڵی ئافرەت گۆڕابوو، لە ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان دژ بەبەریتانیا و شۆڕشی بیستدا بەشداری کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵی هیچ بەشداربوونێکی وەکو ڕۆڵی پیاو نەهاتە ژماردن و لە ڕووی بەرهەمهێنانیشەوە وەکو توخمێکی مرۆیی (عنصر بشری) سەیری نەکراوە هەر ئەو نەخەملاندن و کەمتەرخەمییە وای کرد کە ڕەوتی کرداری دووفاقی لە ئافرەتدا فەراهەم بێت[17].

بەشدار نەبوونی مێینە لە بواری سیاسەت و بڕیارداندا کەلێنێکی زەق و حاشا هەڵنەگرە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وەکو ڕەگەزێکی خولقێنەری مرۆڤایەتی سەیر ناکرێت، هەردەم ئەو مرۆڤە پارسەنگێ دەداتەوە کە چەند

تاوانی جینات و کرۆمۆسۆماتی دراوەتە پاڵ سروشت، ئەم تاوانەش بەشێوەیەک پەردەی گوێی دەسمێت کە خۆشی باوەڕی بەو کەم نرخاندن و ناتەواوی و کەموکوڕییە کردووە کە دراوەتە پاڵی.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت عەقڵی کورد لە سایەی نەبوونی کیان و کەسایەتییەکی نەتەوەییی ڕاستەقینەوە، هەمیشە بەڕووکەش لە چەند و چوون و بەرەوپێشچوون و گۆڕاندایە لە ناوەڕۆکدا، لە ڕووی پەراکتیککردنی تیۆرییەوە عەقڵیەتێکی وەستاو و نەگۆڕە و بۆ وەدەستهێنانی خواستەکانی خۆی زیاتر ڕووبەڕووی شکست بووەتەوە. بەو شێوەیەش دەبینن خەباتی سیاسیی ژن بەرەو پووکانەوە دەچێت، ئەو شکستە لە بوارە جیاجیاکانی تریشدا بەرجەستە بووە لە هەمووشیان زیاتر لەبواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، لەبواری ڕامیاریشدا بەتەواوی بووە بەمانشێتی چەند و چوونەکانی ڕۆژانە و هیچی دی. بۆ سەلماندنی ئەم چمکەش بابگەڕێینەوە بۆ ڕەهەندەکانی پێش بەدەسەڵاتبوونی سیاسەتی کوردی، ڕۆڵی خودی سیاسەتی کوردی بەر لە دەسەڵاتبوونی ئەو سیاسەتە (١٣-١٤) ساڵ بەر لە ئێستا بەهای ژنی پیرۆز دەکرد و خەباتی سیاسیی ژن لە شاخدا و لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی ناو شاردا هەر لە گواستنەوەی چوکلێتە نامەوە، هەتا ئەوانەی وەکو پێشمەرگە خەباتی سیاسییان تۆمار کردووە. هەر ئەو ژنە شارنشینەی کە دوای کەسوکاریان دەکەوت و پاڵنەرێکی زیاتری لادێ نشینەکان بوون بۆ بەئەنجام گەیاندنی هەندێ کاروباری سیاسی جگە لە خزمەتکردن بەگیانێکی لێبوردوانەوە. هەتا ئەو ژنانە لە بەندیخانەکاندا ئازار دەدران و (اغتیساب) دەکران و دوایش کۆمەڵگا دەیکردن بەقوربانی داوونەریت، کەچی لە مێژووی چەند ساڵەی پراکتیکی سیاسەت و دەسەڵاتی کوردیدا، سیاسەت بوو بەچمکێکی هێندە تۆقێنەر جارێکی تر (بڤە. نە.) بۆ مێینە فەراهەم بێنێت.

ئەمەش تەنیا بەڕەچاوکردنی پەیرەو و پرۆگرامەکانی لایەن و لایەنکاری و هەلومەرجە دژوارەکانی سیاسەت نا، بگرە بەگەڕانەوە بۆ بنەمای



سیاسەتی کوردی و ڕەچاوکردنی ئەو دووفاقییەی کە زۆربەی سیاسەتمەدارانی تێدا دەژی، بەوەی کە لەو ساتانەدا بانگهێشتنی ئازادی و ماف و یەکسانییان و بۆ ژنان دەکرد، پەیڕەو پرۆگرام و بانگکردنیان بۆ ئامادەکردنی ژنان بوو لە ڕێکخستن و بوارەکانی سیاسەتدا، بەڵام هەر زوو دووفاقی مەشیسمو (Machismo)یەت زاڵ بوو بەسەریاندا سەرەتا بەوەی ڕێگایان لە خێزان و خوشک و کچانی خۆیان دەگرت لە چوارچێوە و قاڵبی دوور لە سیاسەتیان دەدان یان ڕەوانەی هەندەران دەکران، قۆناغی دوای ئەوەش ونبوونیان بوو لە دەروازەکانی زایندە (الجنس) دەروونی خۆیان ئەوەی کە پیاوەتی لای پیاوی ناحاڵی بەرجەستە دەبێت، ئەمریکای لاتینی ناوی ناوە (ساد و ماسوشی) ماسوشیت و لە هەمان کاتیشدا سادیەت، بەڵام (برسیمان) زانای کۆمەڵناسی بەپیاوانی ڕۆشنبیری دۆڕاو Men vanitg caltur ناوزەدیان دەکات.

ئەم ناو لێنانەش بەهۆی ئەو نابەرابەرییەوە بوو کە لە ئەمریکای ناوەڕاست و ئەمریکای باشوور لە ساڵانی ١٩٦٢ لە ئارادا بوو، دەبوو پیاوانی سیاسەتی دیماگۆگی زیادەڕۆیی لە کردارەکانیاندا بنوێنن وەکو (ماشو machow)، ئەگەر بیانویستایە دەرکەوتووبن لە هەڵبژاردنەکاندا، ئەویش لەو شێوەیەدا خۆی دەبینی کە بەربادیی سێکسی لە ژیاندا گەورەترین کاریگەریی هەبوو لەسەر هەڵبژاردن، بەوە دەهاتە ئاکام کە پیاوی سیاسی دڵخواز (عیشقە)یەکی شۆخوشەنگ و دیاری هەبوایە بۆ ئەوەی لە قاوەخانە و ئاهەنگی شەوان تەنانەت لەو کۆنگرانەشدا کە حزبەکانیان دەیانبەست دەیانخستنە ڕوو بەمەش دەوترا جۆرێک لە دیماگۆکییەتی پەسند.

ئەو پەسندییەش لەوەوە بەرجەستە دەبوو کە ژیانی زیندەیی (جنسی) خۆیان بەسێ جۆر دابەش دەکرد، بەشێکی لەگەڵ سۆزانییەکاندا دەبردە سەر، لە پرۆگرامی سیاسیشیاندا بەردەوام هەوڵی ئەوەیان دەدا کە ئەم جۆرەیان لە چواردەوریان کۆوە بێت، جۆری دووەمیان سەرقاڵبوون بوو

بەخۆشەویست یا مەعشوقە ڕەسمییەکانیان و لەگەڵ ئەوانەشدا کەمتەرخەم نەبوون بەرامبەر بەژنەکانیان.

هەنوکە ئەم ئاکارە نیگەتیڤییە سەرتاپای سیاسەتی کوردی داگیر کردووە و سیاسەتمەداری کورد نەک هەر چەندین و مەعشووق و... هتد یان لەدەوری خۆیان کۆکردوونەوە بگرە ئەوانەش پاش ماوەیەک زانییان دەست نادات تاوانێکی دەدرێتە پاڵ، کەم نین ژمارەی ئەو ژنانەی بێ تاوان کوژران یان تاوانێکی کۆمەلایەتی بۆ دروست کرا، ئەوانە بێ تاوان ئاوارە بوون و مەنفایان هەڵبژارد، ئەوانە تووشی حاڵەتی دەروونی بوون ناوی نرا دەردی خوا، ئەوانەی لە هەموو شتێک دوورکەوتنەوە و ناویان نرا بێ توانا... تاد، بەڵام لە بنەمادا تاوانیان تەنیا مل نەدان بوو بۆ پیاوانی دەسەڵات وەکو ئەو تاوانانەی لە سەردەمی ڕێژێمدا دەدرانە پاڵ ژنی کورد و کەسوکاری پێشمەرگە. واتە ئەو دیماگۆکییەتەی سیاسەتی ئەمریکای ناوەڕاست لە ساڵانی ٥٠-٦٠ گواسترایەوە نێو سیاسەتی کورد ئیدی کەسیش گوێی لە دەنگی زوڵاڵی ئەوان نەبوو بۆ بانگهێشتن کردنی ژنان، ئەو هەڵەیە ئەمریکا قەرەبووەکەی قورس دا کوردیش پێ دەچێت وایانزانیبێت ئەوە مانای ئەو دیموکراسییەیە کە باسی دەکەن بۆیە بەهەمان شێوە قەرەبووی قورستریان دا بەخەڵکی لێقەوماو برینداری کورد.

پاش ئەو سەرزەنشتانەی لەو قۆناغەدا بوو بەخەڵاتی سیاسی کوردی، مۆرکێکی نوێتریان هێنایە پێشەوە، دیارە ئەم قۆناغەیان ئەوەبوو کە دەبوو نوێنەرایەتیی ژنان لە کۆمیتە حزبییەکانەوە بگوێزرێنەوە بۆ پۆستە باڵاترەکان وەکو وەزارەتی بەڕێوەبەری گشتی و ئەندامێتیی بەرزتر لە کۆمیتەی حزبەکاندا و نوێنەرایەتیی حزب لە داوودەزگا و دەرەوەی کوردستان، ئەمەشیان بەو شێوەیە دابەش کرا کە چەند پۆستەکە بەرزتر بێت ژنێکی زیاتر نزیک، خزم و کەسوکار و ژنی سیاسەتمەداران و دەسەڵاتی کوردی خۆی بۆ هەڵبژێرن و، ئەوەشی بۆ ملهوڕی دەسەڵاتێکی نا دیموکراسی گونجاوترین سایسەتە کە ژنی تێدا کوێلە بکەن و تێیدا ببێت بەژنێکی



گوێڕایەڵ و بەڵێکار بۆ سەرجەم گوتار و جیهانبینیی پیاوان و پراکتیزەکاریی سەرجەم میکرۆبە نامەعریفییە کۆمەڵایەتییەکانی پیاوانی سیاسەتمەدار و بڵاوکردنەوەی ئەو میکرۆبە کوشندەیە بەنێو هۆش و عەقلی سەرجەم ژناندا لە ڕێگەی ئەو جۆرە نوێنەرانەوە، بەو شێوەیە ژن فریای ئەوە ناکەوێت بیر لە هەوڵێکی مەعریفی و عەقڵانی بکاتەوە، هەموو هەوڵێکیش لە دەرەوەی ئەو دوو فاکتەرەدا نەهلستێت و درۆی مێژووی پێشوازیی لێ دەکات ئەوەش لەبەر بەرژەوەندی ئەو چینەی ئێستای سیاسی کوردیدایە، چونکە:

ئەو ژنانە خێزان و خوشک و ژنی خۆیانن و بەفەرمانی ئەوان هاتوونەتە پێشەوە و لە باشترین حاڵەتدا بەخاتری هەبوونی ئەوان لە بواری سیاسیدا هەڵبژێردراون بۆ ئەو پۆستە و توانا و تێکۆشان و ئایدیا و مەعریفەیەکی خۆیانی لە پێشەوە نییە بۆیە هەر بەفەرمانی ئەوانیش دەگەڕێنەوە و پراکتیکاری فەرمانەکانی ئەوانن. جگە لەوەی تاکی حزبی لەناو کۆمەڵی حزبیدا کە بەسیاسەتی حزبایەتی چەوت پەروەردەی فیکری کراون خاوەنی باکگراوندێکی مەعریفی و زانستی مرۆیی و تەنانەت نەتەوەییش نین کە بتوانن ببن بەخاوەنی گوتاری ژنانە و، سیاسەتی کوردی و جیهانیش نەک هەر ژن بگرە هەموو مرۆڤ و تاکێکی خاوەن گوتاری مەعریفی لەناودا جێگەی نابێتەوە چونکە لە بنەمادا گوتاری مەعریفی کە بۆ دەرکەوتنی حەقیقەت و جوانکردنی ناشیرینەکانە و گوتاری سیاسیش گوتاری درۆ و ناشیرینکردنی جوانییەکان بەشاردنەوەی حەقیقەتەکان کە من قەناعەتم وایە ژنان کەمتر دەتوانن لەو جیهانە درۆیە نزیک ببنەوە هەتا پیاوان کەمتر دەربارەی هونەری دووفاقیەت و درۆ گەورەکانی ژێر کڵاوی سیاسەتمەداری تێ دەگەن هەر بۆیە ڕێژەی ژنانی سیاسەتمەدار و هەبوونیان لە سەنتەرەکانی بڕیاردان لە جیهاندا هێندە کەمە کە دەرکەوتنیان مایەی شەرمەزارییە بۆ جیهانی پاتریاکی سیاسی.

## ئاماری پۆستی سەرکردایەتیی ژنان لەبواری ڕامیاریدا

لەنێوان زیاتر لە ١٨٥ دەوڵەتدا تەنێ ١١ دەوڵەت ژن سەرکردایەتییان دەکات، ئەمەش ناوی ئەو ١١ بەسەنتەری بڕیار گەشتووی وڵاتەکەیانە:

١- هیلین کلارک: سەرۆک وەزیرانی نیوزیلەند

٢- تاریا هالۆنین: سەرکردەی فنلەندایە

٣- ماری ماکالیس: سەرۆکی ئیرلەندەیە

٤- شاندریکا کوماراتونجا: سەرۆکی سریلانکایە

٥- مادیو ربوبی: سەرۆکی سەنیگال

٦- فایرافیکی- فرایبرغا: سەرۆکی لاتفیا

٧- جنیڤێر سمیت: سەرۆکی بەرمودا

٨- گلۆریا میکیگال: سەرۆکی فیلیپین

٩- میگاوتی سوکارتو: سەرۆکی ئەندونوسیا

١٠- خالدە زیا: سەرۆک وەزیرانی بەنگلادش

١١- میریا موسکوسو: سەرۆکی پەنەما

ئەو ژنانەی لە جیهاندا پۆستی بریکاری سەرۆکیان وەرگرتووە لە کاروباری حکوومەتدا لە جیهاندا ژمارەیان تەنیا (٤) ژنە و پێک هاتوون لە:

١- ئەیساتو ناجیە سەعیدی: بریکاری سەرۆک وەزیرانی گامبیا.

٢- ئەتسرەید فیشەل فۆلیو: بریکاری سەرۆک وەزیرانی کۆستریکا.

٣- میلاگرۆس ئاورتە زبۆش: بریکاری سەرۆک وەزیرانی دۆمینیکەن.

٤- ئەنتی لۆ: بریکاری سەرۆک وەزیرانی تایوان.

لەنێو هەموو جیهانیشدا تەنیا سێ ژن دادوەری گشتین. یەکەم وڵاتیش کەنەدایە کە بەو هەنگاوە گرینگە هەڵساوە. ئەوانیش:



١- ئەدریان کلارەکسەن: دادوەری گشتیی کەنەدا.

٢- شیلا کاراترایت: دادوەری گشتیی نیوزیلەند.

٣- بیرلەیتی لویزی: دادوەری گشتیی سانت لوبس.

لە هەموو جیهانیشدا تەنیا ٥ ژن سەرۆکی حیزبی ئۆپۆزسیۆنن ئەوانیش:

١- سۆنیا گاندی: سەرۆکی حزبی کۆنگرەی هیندوستان.

٢- وان عەزیزە ئیسماعیل: سەرۆکی حزبی دادی نەتەوەیی- مالیزیا.

٣- ئایۆنگ سان سوکی: سەرۆکی حزبی کۆمەڵەی نیشتمانی لەپێناوی دیموکراسیدا- بۆرما.

٤- جەتنی شیللی: سەرۆکی حزبی نیشتمانی نیوزیلەندا.

٥- ئەنجێلا میرەکل: سەرۆکی یەکێتیی دیموکراتیخوازانی ئەڵمانیا کریستیان (سی دی یو).

ئەو دەردە کوشندەی ژنانی تێوە گلاوە لە جیهاندا تەنیا سەنتەرەکانی سەرکردایەتی و دادوەری نییە، تەنانەت لە پەرلەمانەکانیشدا هەمان هەلاّواردکردن بەدی دەکرێت و ژنان و لاوان لەجیاتی پەرلەمان لەودیوی پەردەی فەرامۆشکردنەوەن، ئەمەش دەتوانین بەئامار بسەلمێنین لە سەرجەم جیهان تەنیا ڕێژەی ١٣٪ی ژنان بەشداری پەرلەمانەکانی جیهانن لەوانەش، وڵاتە پێشکەوتوو و زلهێزەکانن وەکو ئەمریکا و فەرەنسا و یابان، دیسان فەرامۆشکردن و کەمتەرخەمیی بەکاری ژنان و ڕێژەی بەشداربوونیان دیارە و ئاماری هەریەک لەو وڵاتانەش ئەوە دەسەلمێنن کە بانگەشە ساختەکانیان دیموکراسی لە هەناویدا دڕندەیەکی پاتریاک و دیکتاتۆری حەشارداوە.

١- ئەمریکای زلهێز تەنیا ١٢,٢٪ ڕێژەی ژنانی بەشداربووی نێو پەرلەمانە.

٢- فەرەنسا بەڕێژەی ١٠,٩٪

٣- یابان بەرێژەی ٤,٦ ٪

هەر ئەو سێ وڵاتە زلهێزە و کێبەرکێکەرەی دیاردەکانی جیهانگیری لە غەفڵەتدا نازی بەرامبەر مافەکانی ژنان بگرە زۆرینەی جیهانی سیاسەت و وڵاتانی تریش زۆر لە خوار وڵاتانی زلهێزەوە ئاوڕیان لە چارەنووسی ئافرەت داوەتەوە. ڕێژەی بەشداریی ژنانی پەرلەمانی ئەو وڵاتانە حاشاهەڵنەگری ئەو ڕاستییەن، لەوانەش:

١- ئەرجەنتین ٢٧,٦ ٪

٢- ڤیتنام ٢٦ ٪

٣-نامیبیا ٢٢,٢ ٪

٤- نەتەوە ئەفریقییەکان ١٢ ٪

٥- سەرجەم ئەمریکا و ئەوروپا ١٦ ٪

٦- سەرجەم وڵاتە عەرەبییەکان ٤,٦ ٪

٧- مەغریب ٠,٦ ٪

٨- فەلەستین ٦ ٪

٩- نیجیریا ٧,٥ ٪

تەنێ نەمسا یەکێکە لەو وڵاتانەی تێیدا ژن هەڵبژێردراوە بۆ سەرۆکی پەرلەمان، هەتا ئێستا لە جیهاندا لە بری ١٧٨ پەرلەمان تەنیا ٣٦ ژن سەرۆکی پەرلەمانن و ٦٠ پەرلەمانیش لە جیهاندا خاوەنی مەجلیسی تەشریعین. تا ئەمرۆکەش تەنیا (نیوزلەندا) هەموو مافە سیاسییەکانی بەژن بەخشیوە و، هیچ ژنێکی لە مافی سیاسی بێ بەش نەکردووە.

هەتا ئێستا لە جیهاندا تەنیا سوید ڕێژەی بەشداربووانی پەرلەمانی یەکسانە ئەو یەکسانییەشی لە ساڵی ١٩٩٥ەوە بەدەست هێناوە، لەو کاتەوە پەرلەمانی سوید ٤٢ ٪ی ئافرەت بوون.

لەنێو هەموو وەزیرەکانی جیهاندا ژن تەنیا بەرێژەی ٧ ٪یان وەزیرن



ئەویش لە هەموو بوارەکان زیاتر ڕوویان کردووەتە بوارە کۆمەڵایەتییەکان لەوانەش:

١٤ ٪ وەزیری کۆمەڵایەتین بەراورد بەبوارەکانی دی.

٩,٤ ٪ لەبواری دادوەریدا.

٤,١ ٪ لەبواری ڕامیاریدا دەسەڵاتیان وەدەست گرتووە.

٢,٩ ٪ کاروباری جێبەجێکردنیان لەسەر شانە.

هەتا ئێستا تەنیا ٩ ژن لە نەتەوەیەکگرتووەکان کاری باڵوێزی (سفیر)یان خراوەتە دەست ئەوانیش باڵوێزی ئەو وڵاتانەن: ١- جامایکا ٢- کازخستان ٣- لیشنستاین ٤- سۆماڵ ٥- تورکەمانستان ٦- کیرگیزستان ٧- گوینا ٨- فنلەندا ٩- لیبریا.

لە کاری بەڕێوەبردن و جێبەجێکردندا تەنیا ٩ ٪ی پۆستە باڵاکانی بەڕێوەبردنیان دراوەتێ ٢١ ٪ی سەنتەرە باڵاکانی بەڕێوەبردنیان خراوەتە ئەستۆ ٤٨ ٪ دراوە بەژن دیسان بۆ شوێنە خزمەتگوزارییە سیڤیلی و زانستییەکان کە بەپۆستی خوارتر ناوزەد دەکرێن.

## ژن چۆن دەتوانێت نیوەی پەرداخەکە پڕ بکات؟

ئەمەیان ئاماژەمان پێ کرد بەڕەخنەگرتن لە عەقڵ و کردار ئەو هەلەی بۆ دەرەخسێت، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئافرەتی کورد خۆی بخاتە نێو تاقیگەی ئەو شۆڕشە دەروونییە، فاکتەرەکانی دەستەبەرکردنی ئەو شۆڕشە خستنە ژێر پرسیاری خودە. بۆ ئەوەی لە دەرئەنجامدا بگەین بەژێر پرسیارخستنی سەرجەم سیستەمی پاتریاکی. ئەو ژێر پرسیارخستنەش بەوە دەکرێت کە سیستەمێکی باڵاتر لەوەی هەیە و ئەو لە ناویدا ڕاڤەی خەونەکانی خۆی تێدا دەکات دروست بکات. دەکرێت ئەو سیستەمەش ئایدیای فیمینستی بێت، لەنێو تاقیگەی فیمینستیشدا. پێویستە سەرەتا ژن بەخۆیدا بچێتەوە کە لەکوێدایە؟ کاری چییە؟ پێناسەی چییە؟ ئامانجی

چییە؟ لە هەمووشی گرینگتر ئایا ڕێگەیەکی مەشروعی گرتووە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەی.

لەمەیاندا پێویستە هەندێ شتی زۆر ساکار بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی ڕوونی بکەینەوە لەوانەی کە خۆم بینیومە کە بەداخەوە لە ژنانێک وەشاوەتەوە خۆیان بەداکۆکیکاری ژن دەزانن... ژنێک کە هەنگاو دەنێت بەرەو فمینیزم چۆن دەست دەکات بەڕەخنەگرتن لە خود.

١- ئەگەر تۆی ژن لە ڕێکخراوێکی ژنانەدا لەوانەی کە حزبەکان وەکو هەر ڕێکخراوێکی پزیشک و خوێندکار و قوتابی و ئەندازیاریان کردووەتەوە بەئەوەی کە توێژێک لە چین و توێژەکانی کۆمەڵی بۆ ڕێک بخات، ئەوە بێ گومان ئەو ژنە فیمینستە نییە، چونکە فیمینست ئەو مرۆڤە نییە، ئەو ژنە نییە کە لایەنێکی پاتریاکی وەکو ئامێری جێبەجێکردنی ئایدیای پاتریاکی بەکاری دەهێنێت. جیهانبینیی پیاوسالارانەی قبووڵ نییە و ڕەخنەی لێ دەگرێت.

٢- ئەگەر تۆ لە ڕێکخراوێکی بەناو سەربەخۆی لەوانەی لە ناوەوە یان لە دەرەوەی کوردستاندا دامەزراون، بەڵام متمانەیان لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە خستووەتە سەر دەسەڵاتەکان و بەناوی مافی ژنەوە دەسەڵاتەکان لە خۆیان و خۆیان لە دەسەڵاتەکان نزیک دەکەنەوە و ژنانی کەنارگرتوو و بەش مەینەتی و چەوساوە و کرێکار و هەڵاواردووی دەروون لە کێشە سەرەکییەکان، تۆ فمینیست نیت، چونکە فیمینست ئەو مرۆڤە نییە کە خەونی باڵابوونی لەگەڵ دەسەڵاتە جیاوازییەکاندا هەیە، ئەو مرۆڤەیە کە خەون و مەینەتی و ئازارەکانی ژنان لە نەوییەوە دەبات بۆ باڵا، بۆیە کارکردنی لە واقیعەوە هەڵدەزەنێت بۆ باڵا، لە سەرەتادا لە هۆی بەتاڵبوونی نیوە پەرداخە دەپرسێت نەک دەست بەباڵگرتنی نیوە پڕەکە.

٣- ئەگەر لە بوارێکی ڕۆشنبیریدایت و ناڕەواییی پێشکەوتنی هاوڕەگەزەکەت دەبینی و پێی شێتگیر دەبیت و شێلگێرانە دەکەوێتە



سەرزەنشتکردن و تەکتەلول کۆکردنەوەی پاتریاکەکانی دەوروبەرت کە تۆ ئامێری جێبەجێکاری فەرمانەکانیت. ئەوا فیمینست نیت و جوانتر ئەو وشەیە بەکار نەبەیت و تەنانەت خۆشت بەداواکاری مافی ژنیش ناوزەد نەکەیت، چونکە فیمینست ئەو مرۆڤەیە کێبەرکێی هاوڕەگەزەکەی ناکات بگرە پێشبڕکێی سەرخستنی مەسەلە پیرۆزەکەیان دەکەن بەرامبەر سیستەمی پاتریاکی. گوتاری ئافرەتانە- ژنانەی خۆی دەبێت بەرامبەر گوتاری پاتریاکی و دەبێت جیهانبینیی ژنانەی ئەو لەوە گەورەتر بێت کە هیچ گوتارێکی پاتریاکی بتوانێت گوتارێکی مێینانە، گوتارێکی فیمینستانە بهێنێتە پەراوێز، نەک خۆی دەست تێکەڵی سیستەمی پاتریاکی و نووسەرەوەی گوتارە پاتریاکییەکە بێت لە دژی گوتاری فیمینستیی ئەو ژنە، یان با بڵێین ئەو ژنە گوتاری ژنانی نییە چونکە پێشبڕکێی سەرەکیی پێویستە لەسەر چۆنیەتیی پڕکردنی بەشە بەتاڵەکەی پەرداخەکە بێت.

٤- ئەو ژنەی وێنەیەکی قەشەنگی هاوڕەگەزەکەی سەرکەوتنێکی هاوڕەگەزەکەی دەبینێت لە کەناڵەکانەوە تووشی هیستریا دەبێت. بەسەدان وێنەی جۆراوجۆر و دەیان بابەتی بێ ژێدەر و نازانستی و ناوناتۆرە بڵاو دەکاتەوە و کەف و کوڵی دڵی بەو دادەمرکێنێتەوە وا هەست دەکات ئەگەر بابەتەکانی زیاتر بوو مێژوو بەمەزنتر ناوزەدی دەکات یان مێژووی جوانتر و پڕشنگدار دەکات، یان ئەگەر خەڵکی لەکەدار کرد خۆی جوانتر دەبێت، خەڵکی گوناهبار کرد گوناهە زۆر و زەوەندەکانی خۆی دەشارێتەوە یان هاوگوناە دەدۆزێتەوە و ئیتر لۆمە ناکرێت، ئەمە کردەوەی فیمینست نییە، بەڵکو ئەوە لە زانستی دەروونیدا پێی دەوترێت نەخۆشیی کەمسەری واتە هەست بەکەمی کردن، مرۆڤی فیمینستیش مرۆڤێکی تەواوە، نەخۆشییە دەروونییەکانی خۆی چارەسەر کردووە، باوەڕی بەکۆششە بۆ هەوڵی گۆڕینی ئەو کولتوورە دارزاوەی ئەوی ژن بەگوناهبار نیشان دەدات نەک پەرەپێدانی. ئەنجا توانیویەتی ببێت بەخاوەنی گوتارێکی مەعریفی

فیمینستی. فمینیزم خەباتێکی بابەتییە نەک جۆری، خەباتێکی مەعریفییە نەک نەهلیستی، خەباتە لەسەر بابەتی پڕکردنی پەرداخەکە، چونکە دەکرێ پڕ بکرێت و لێشی بڕژێت، بەڵام پڕکردنێکی بابەتی نەبێت.

لێرەدا دوو دێرە شیعری گەورەی کورد پیرەمێرد دەهێنمەوە، بەڵام هێنانەوەی ئەم دوو دێرە مەبەست کردەوەی فیمینستە بەهەڵەچووەکاندا دەهێنمەوە نەک پەرداخە نیوە بەتاڵەکە.

دەبێ بەخشندە ملکەچ کا لە ئاستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی بۆ پیاڵە سەر فرۆ دێنێ کە تێکا بۆی

پیرەمێرد لە بەخشندە و مەبەستی خاوەن دەسەڵات و خاوەن کار و بەپێی بارودۆخی ئەو کاتە ئاغایە و مووچەخۆریش، فەرمانبەر و کرێکار و وەرزێر دەگرێتەوە لێرەدا بەمەبەستی... کەسی یەکەم کە دەسەڵاتدارە یاخۆ مووچەدەری کەسانی مووچەخۆری نابێت لە دادوەری و مامەڵە و مافەکانیدا بەخشندە نەبێت بەئارەزووی خۆی یان ئەو ناحەزانەیان لەگەڵدا بکات کە لای ئەوانی دەسەڵات بۆیان تێ دەچنێن و ڕووخساریان ڕەسەن دەکەن، چونکە ئەوە ڕووی دا ئەو سوراحییە ئاوەی کە لێی دەکرێتە پیاڵەوە لێی دەڕژێ و فروو دەکات.

ئەو شێوەیە بەسەرجەم دەسەڵاتە جیاوازییەکاندا پراکتیک دەبێت. دەرئەنجامی... سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری، ژنانی... ژنێک ئەگەر لە لووتکەی دەسەڵاتی ژنانەشدا بێت، لە لووتکەی دەسەڵات و توانای ڕۆشنبیریشدا بێت ئەگەر نەیتوانی مامەڵەیەکی مەعریفییانە و دروستی لەگەڵ دەسەڵاتەکەیدا بەرجەستە بکات... نەیتوانی لە بری هەڵوێستی لاواز و نەخۆشی لە بری کێبەرکێی نارەوا بەخشندە بێت و بەچاوی ڕێز و گەورە لە سەرەتا سەیری خۆی بکات بۆ ئەوەی بتوانیت ڕێزی بەرهەم و چالاکیی خەڵکی تریش بگرێت. ئەو ژنەی دەکەوێتە نێو کارتێکەری ئیرەیی، مرۆڤێکە کە خۆی و بابەتی خۆی لا کەمە و ناتوانێت



ڕێزی بەرهەمی خۆی بگرێت، بۆیە تووشی ئەو نەخۆشییە دەبێت، مرۆڤی فیمینست لەو جۆرە ئاکارە بێ بەرییە، هەر ژنێکیش تووشی ئەو تەنگژە دەروونییە بوو ئەوا بەشی دووەمی شێوەکەی بەسەردا پراکتیک دەبێت و پەرداخەکەی بۆ پڕ دەکرێت و لێشی دەڕژێت، بەڵام پڕ لە مایەپووچی خۆی و بێ ئومێدی بەرامبەر بۆی. کاتێکیش دەگات بەو ئاستە ئەوا نەک کاری بۆ بەرژەوەندی پڕکردنی شێوە بەتاڵەکەی پەرداخەکە نەکردووە، بگە هەوڵی داوە شێوە پڕەکەشی پڕ خڵتە و خەوش و لێڵی بکات.

٥- ئەو (ژنان- ئافرەتان- خانمان)ەی خاوەنی دەسەڵاتی ژنانە و ڕاگەیاندنی ژنانە و تەنیا قەڵەمی پیاوان و بایەخی پیاوانی لە دەرەوەی خۆی کۆکردووەتەوە، هەمیشە چاوی لە ئاستی ژنانی داهێنەر و دەرەوەی ڕێکخراو و گرووپ و حزبەکەی داخستووە و ڕاستتر بڵێم لەناو حزبەکەشیدا چاوی ڕۆژنامەکەی خۆی و جێگەکەی لە ئاستی ژنانێکی لە خۆی داهێنەرتردا داخستووە، ئەو ژنە نەک فیمینست نییە، بگرە کەسێک نییە دەربارەی مەسەلە ساکارەکانی ژنانیش تێ بگات ئەگەرچی بڵاوکراوەشی بەوشەی ژن و کێشەی ژن مافی ژن بڕازێنێتەوە... ئەو جۆرە ژنانە تەنیا هەڵگری ئاڵای پاتریاکی و لەبەر دەرگی دەزگا پاتریاکییەکاندا خۆیان پڕ چەک کردووە بۆ پاراستنی عەقڵیەت و کولتوور و سیستەمی پاتریاکی.

٦- ئەو ژنانەی شەڕی حزبەکان دەکەن ئەوانەن کە بەهۆی کەسوکاری دەسەڵاتداری و حزبییەوە گەیشتوونەتە دەسەڵاتی سیاسی و ڕێکخراوەیی، ئەوانەی بەهۆی پاراستنی عەقڵیەتی پاتریاکیی دەسەڵات و حزبە جیاوازەکانەوە گەیشتوون بەدەسەڵات، هیچ کام لەوانە فیمینست نین، چونکە هیچ کام لەوانە خاوەنی دەسەڵاتی مەعریفی و فیکریی خۆیان و گوتاری ژنانە نین، بگرە ڕۆژانە گوڵەبەڕۆژەی گوتارە پاتریاکەکانی کە بۆیان دانراوە دەترووکێنن و ناتوانن لێشی لابدەن، ئەگەر بەڕاستی بۆ باکگراوندی پڕ سەختی ژن بگەڕێنەوە بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو جۆرە ژنە

چاودێرەی خواستی پاتریاکی هۆی مەینەتی و سەختیانەن چونکە:

أ- خۆیان خاوەنی هیچ جۆرە گوتارێکی ژنانە نین و بەهیچ شێوەیەکیش ڕێگە بەگوتاری ژنانە نادات دزە بکاتە نێو دەسەڵاتی پاتریاکی ئەوانەوە.

ب- لەبەرئەوەی لەنێو دەسەڵات و حزبە جیاوازەکاندا ڕۆڵی نوێنەری کۆمەڵی ژنان بەوان دراوە. ژنانیش لەو ڕاستییە تێ گەیشتوون ئەگەر ڕامی عەقڵیەتی پاتریاکیی ئەوان نەبن هیچ بەرگرییەکیان لێ ناکرێت و کێشەکانیان بۆ چارەسەر ناکرێت، بۆیە لە لایەک کۆمەڵێکی ژن نائومێد بوون و لە خەباتی ژنانە دوور کەوتوونەتەوە، کۆمەڵێکی تریش لە هەر لایەکەوە ڕەشەبا بێت باراشی بەبا دەکات و هەمان نەزمی پاتریاکیی ئەوان پراکتیک دەکات و لەناو کۆمەڵدا بووە بەدەنگی دووەمی ئەمان، ئەمەشی بۆ خۆی مەترسیدارە، چونکە پەرەپێدەری سیستەم و عەقڵیەتی پاتریاکییە، بڵاوکەرەوەی ئەو ڤایرۆسەشە لەنێو عەقڵی و هۆشی ژنانی دیشدا بەتایبەت ژنانێک کە خۆیان خاوەنی هۆش و بیری کۆمەڵایەتیی دروست نین، ژنانێک نەخوێندەوار، ژنانێکی بەشمەینەت و چەوساوە کە ئەوان بەتەنیا بەفریادڕەس دەزانێت، کاتێکیش دەگات بەلای فریادڕەسەکەی ئەویش دەیباتەوە نێو عەقڵیەتی پاتریاکی بەشێوەیەکی دەمامکدار و بەکاغەزی مۆدێرن و ڕازاوە.

ج- هیچ کام لەو ژنانە ئەو کارەی خۆی نەقۆستووەتەوە بۆ ئەوەی تەنیا بۆ هەفتەیەکیش بێت یاخی بێت، بانگەشەی گوتارێکی ژنانەی یەکگرتوو بکات و چوارچێوەی پاتریاکیی داڕێژراوی بۆ وردوخاش بکات و تەنیا ڕۆژێک ببێت بەخاوەنی مێژووی ئەو یاخیبوونە. پاشان با دەریشی کەن، نەک ساڵانێک ببێت بەخاوەنی مێژووی پارێزەری گوتاری پاتریاکی.

د- هیچ مرۆڤێکی کورد ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیبینی یەکێک لەو ژنانە بەدەنگێکی بەرز بیر بکاتەوە و ناتەواوییەکانی پرۆگرامی حزبەکەی بخاتە ڕوو. خاوەنی ئەو ڕەخنە مەعریفییە بێت کە پەرداخەکەی پڕ بکات.



ه- هیچ کام لەو ژنانە جارێک یاخی نەبوون لە هەر کردەیەکی نادروست کە لەلایەن حزبەکەیان بەرامبەر بەژنێک دەکرێت، بەتایبەت بەرامبەر بەو ژنانەی کە لە دەرەوەی حزبەکەی ئەوانن، ئەوەش واتا ڕازی بوون بەعەقڵ و سیستەمی پاتریاکییە و هەبوونی هەر سیمایەکی پاتریاکیش ناتوانێ خۆی لەنێو گوتاری ژنانی فیمینستیدا بدۆزێتەوە.

و- هەتا ئێستا ئەو جۆرە ژنانە نەیانتوانیوە خاوەنی ڕێسا و یاسایەکی سیڤیلیانە و گوتارێکی سیڤیلیانەی دوور لە بەرژەوەندی حزب بن کە لە دەرەوەی کاری کۆمیتە حزبییەکەیان بۆشاییەک هەبێت بۆ عەقڵ و لۆجیک ئەوانی تێدا کۆ بکاتەوە و بتوانن یەکدەنگی لە کێشەکاندا، ژنانەیی لە گوتارەکاندا فەراهەم بهێنن. ئەمەش ناچێتە پێناسەی فیمینستیتەوە.

٧- ئەو ژنانەش کە لە دەرەوەی ژنانی خاڵی ٦ سەربەخۆ و ئازادن لە دەربڕیندا، ئەو ژنانەی ئەمڕۆ خەریکن بەدوای گوتارێکی فیمینستانەدا بگەڕێن، دەستپێکی کارەکانیان و کۆکردنەوەی گوتارە ژنانەکانیان لەو ژنانەوە دەست پێ دەکەن کە باسمان کردن، ئەوانیش گەرچی سەربەخۆ بن و لەناو هیچ کام لەو ڕێکخراو و دەزگایانەدا نەبن، گەرچی خواستی گوتاری فیمینستانەیان هەبێت، دیسان ئەوانیش فیمینست نین، چونکە فیمینست گوتاری ژنچێتی نییە، کاتێک من خۆم بەفیمینست بزانم بچم کەسانێکی داکۆکیکار و درێژەدەر بەعەقڵی پاتریاکی و حەسحەسێکی بەوەفای دەرگا ئاسنینەکانی پاتریاک لە خۆم کۆ بکەمەوە، کەسانێک کە چاوی ژنانی داهێنەر و سەربەخۆ نەبینێت، ئەوا من هەرگیز نەک فیمینست نیم بگرە لە ئایدیای فیمینزم تێ نەگەیشتووم، چونکە بەکورتی فیمینست واتە هەبوونی گوتارێکی ژنانی مەعریفی بۆ پالاوتنی پەرداخە نیوە پڕەکە و پاککردنەوەی لە هەموو خڵتە و خەوشەکان و پڕکردنەوەی نیوە بەتاڵەکەیەتی... واتا ژنێک گەر وابزانێت فیمینست واتای لەخۆگرتنی هەموو جۆرەکانی ژنانە بەوانەشەوە کە بەهەڵە چمکی ژن و مەسەلەی ژنان بەکار دەهێنن ئەوە ڕاست نییە، چونکە ئەو کات دەچێتە خانەی

ژنچێتییەوە، وەکو یەکێک لە هەموو بزووتنەوە لە سروشت دەرچووەکانی ئیسلامی و تیرۆریستی و چەپێتی و... هتد لێ دێت، ئەوانەی کە ئایدیۆلۆجیایەک دەپەرستن بەبێ ئەوەی بیر لە هەڵەکانیان بکەنەوە، ئەوانە فیکرێک هەڵدەگرن و تەتەڕوفی تێدا دەکەن. هەموو تەتەڕوفێک لە هەر ئایدیۆلۆجیایەک و، فیکر و بڕوایەکدا دواکەوتوویەتییە. ئایا ژنانێک هێندە دواکەوتوو بن تەتەڕوف بکەن لە مەسەلەی ژنێتیدا، تا ڕادەیەک ژنانی هەڵە لە بۆچوون و ژنانی پارێزەری فیکری پاتریاکی پێ پەسەند بێت و بهێنێتە نێو ئەو خاڵەی دەیەوێت ببێت بەخاڵی دەسپێکی فیمینستی، ئەو ژنە فیمینستییە؟!

بێ گومان نەخێر، لەبەر ئەو هۆیانەی دەستنیشانمان کرد جگە لەوەی گورزیش لە بزووتنەوەی فیمینستی دەدات بەوەی بۆ ژنانێک کە ئومێدیان بەبزووتنەوەی فیمینستی بێت بۆ گۆڕینی بارودۆخی چەقبەستووی ئەوان، بێ ئومێد دەبن. بزووتنەوەی فیمینستیش بەهەمان نواندنی ڕابردوو ژنانی پراکتیکاری عەقڵی پاتریاکی سیاسی کۆمەڵایەتی دەبینن. ئەرکی فیمینست لێرەدا ئەوەیە کە بۆ ژنانی بەش مەینەتی پیشان بدات ئەگەر هەڵەی ژنە دروستکراوەکان ئەمانە بن، ئەوا هەڵوێست و ڕێگەی ئێمە پێچەوانەیە، ئەم ئاکارە زانستی و مرۆیی و ڕاستگۆیانەیە کە پیشانتان دەدەین.

٨- ئەو ژنەی وا دەزانێت مافەکانی ژن و سەربەخۆیی و ئازادیی ژن ئەوەیە لاسایی پیاو بکاتەوە یاخۆ بەهەڵاواردنی ڕووخسار و شێوەی خۆی بەرجەستە دەبێت ئەوە نەخاوەنی گوتاری ژنانەیە و نەگوتاری فیمینستی دەتوانێت پەسەندی بکات، چونکە لە بنەمادا فیمینیست و گوتاری ژنانە واتە پاراستنی مێیەتیی ئافرەت. ئازادی واتای پۆشینی جلی پیاوانە و ستایلی قژبڕینی پیاوانە و کردەی پیاوانە و زەبروزەنگی زمانی پاتریاکیی پیاوانە و... تا دوایی نییە. ئازادی واتا گەشەکردنی هۆشیاری تا ئەو ڕادەیەی کە نە مەڕ بێت بخورێت و نە گورگیش بێت بخۆیت.



٩- ئەو ژنانەی لە قسەکردن و توانای دەربڕیندا بەرامبەر ناچیزەکان بێدەنگی هەڵدەبژێرن بەواتای خۆ جێگەکردنەوە، سەنگینی، دیپلۆماسییەت، بەرژەوەندی و بیانووی تر نارەوا، ئەو ژنە نە داکۆکیکاری مافی ژنە و نەدەتوانێت فیمینست بێت چونکە لە ڕووی دەروونییەوە خاوەنی جورئەتی ناسینی خۆی نییە هەتا بەرامبەرەکەی بناسێت. لێرەدا دەتوانم بەنموونەیەکی ڕاستەقینە مەبەستەکەم زیاتر ڕوون کەمەوە.

(جارێک ڕۆژنامەیەک، ڕیپۆرتاژێک لەسەر کچێکی بواری ڕووناکبیری دەکات دەچێت پرسیار لە دوو ژنی نزیک لە کچەکە دەکات کە یەکێکیان لە ڕۆژنامەیەکی گەورەی حزبیدا کار دەکات و لاپەڕەیەکی ژنانیشی پێ سپێردراوە، یەکێکیشیان شاعیرە و خۆ بەسەربەخۆ دەزانێت بەڵام وەڵامی ڕۆژنامەکە نادەنەوە و دەڵێن ڕاستە ئەو خانمە شایانی ئەوەیە شتی باشی لەسەر بووترێ، بەڵام ئێمە نامانەوێت هیچ بڵێین چونکە لەگەڵ فلانە دەسەڵاتدا ناکۆکیی هەیە، جا ئێمە نامانەوێت بەهۆی ئەوەوە دڵی ئەو دەسەڵاتەی بەرامبەرمان گەرد بگرێت). ڕیپۆرتاژەکە تەنیا بەڕای پیاوان کۆتاییی دێت نەک ڕای ژنان ئەوانیش بڵاوی ناکەنەوە چونکە شەرم دەکەن ئاستی ژن بەو ئاستەدا بێت، بەهۆی دڵی دەسەڵات، ترسنۆکی، ئیرەیی و... هتد.

ئەوە ئەو لەعنەتییەیە ئەمڕۆ ناوچاوانی ژنی کوردی گرتووە، پێویستە بزووتنەوەیەکی فیمینستی ئەم جۆرە ژنانە تەنیا بخاتە بۆتێکی پیاوانی پاتریاکی دەسەڵاتەوە بۆ ئەوەی سەما بۆ دڵی ژەنگاوییان بکەن. چۆن مرۆڤێک فیمینست بێت دەتوانێت خاوەنی بزووتنەوە و فیکر و دەرکەوتەی فیمینست بێت بەکۆنتاککردنی و متمانە خستنەسەر ئەو جۆرە ژنانە ئەگەر خۆی خاوەنی ئەو هۆش و ئیرادەیە نەبێت.

١٠- ئەو ژنانەی کە لەگەڵ دەسەڵاتدارەکاندا بەشداری پرۆژەی ئەتککردن و ڕووشاندنی کەرامەت و لەناوبردنی ژن دەکەن[١٨] خۆیان لە ڕێکخراو و سەنتەر و کۆمەڵە جیاوازییەکانی ژناندا توند کردووە، بەڵێ

ئێمە ئەو جۆرە ژنەمان هەیە کە پلانی کوشتنی ژن دادەنێت، کە دەستی سیخوری لەگەڵ دەزگا سیخوڕەکانی دراوسێ تێکەڵ دەکات، کە شار بەشار دەکات بەناوی خەڵکانی تر و تەنانەت خۆی دەهێنێتە ئاستێک بەناوی سکرتێرەی ژنانێکەوە کە هەرگیز حسابی بۆ نەکردووە دەچێتە وڵاتان و داوای دیدار دەکات، بەڵێ ژنانی خۆ بەفیمینست زان ئێمە ژنی لەم جۆرەمان هەیە تۆ ئەگەر دێیت ئەم تاوانانەی وەکو بانگەشەی حزبەکەی بەچالاکی و ئازایەتی و کاری ژنانە بۆ دەژمێرێت ئەوا تۆش وەکو ئەو تاوانباریت، ئەرکی تۆ سڕینەوەی ئەو جۆرە سیخوڕە حزبییە پاتریاکییەیە لە ناو بزووتنەوەی ژناندا، چونکە ئەو جۆرە ژنانە غەدر لە وشەی ژنێتی و مرۆڤایەتی و هەموو شتێکی پیرۆز دەکەن. ئەو جۆرە تازە گەیشتوون بەقۆناغێک لە تاوانکاری کە ناتوانن چارەسەری خۆیان بکەن، بگرە پێویستە ئەو ژنانەی خۆیان بەفیمینست دەزانن:

١- ئاگایان لەوە بێت نەکەونە ژێر کاریگەریی بیروبۆچوونی لە بنەمادا تیرۆریستی و پاتریاکیی ئەم جۆرە ژنانە کە لە ڕووکەشدا بەچالاکی و مەزنی بۆیان تۆمارکراوە.

٢- پوولی نێو دەستەکانیان بخەنە ڕوو بۆ ئەوەی بۆ هاوکردارەکانیان ببن بەنموونەیەکی قێزەوەن کە لەو جۆرە ژنە لەنێو کورددا تەشەنە نەکات. بنبڕکردنی ئەو جۆرە کردارە دیکتاتۆرییە کە لە لووتکەی تاوان و نەخۆشییە دەروونییەکانی سیستەمی پاتریاکی و دڕندەیی مرۆڤ لە ئەستۆی ژنی فیمینست و مرۆڤی مرۆڤخواز و ڕاستیخوازدایە.

١١- ئەو ژنەی کە ڕەخنە لە خۆی و حزب و ڕێکخراوەکەی بگرێت پێی شێتگیر دەبێت و دەکەوێتە سەرزەنشتی ڕەخنەگرتوو پێی وایە ئەو کارانەی کە کراوە زۆرە و زۆر گەورەن ئەو ژنە فیمینست نییە، چونکە فیمینست بەردەوام لە ڕەخنە لەخۆگرتندایە بۆ ئەوەی بگات بەحەقیقەت، بەردەوام لە خوێندنەوەی خۆیدایە بۆ ئەوەی هەڵەکان بدۆزێتەوە، هەمیشە ڕەخنە بەختەوەری دەکات بۆ ئەوەی هۆی بەتاڵیی نیوە بەتاڵی پەرداخەکە بزانێت



بۆیە ئەو جۆرە مرۆڤانە چاکتر وایە لەوە خۆیان دوور بخەنەوە کە بانگەشەی فیمینستی بکەن.

١٢- ئەو ژنەی باسی مافی ژن دەکات و خۆی بەسەمبوڵی فیمینستی پیشان دەدات بۆ ئازادی ژنان و خۆی ئازادی ژنانی تر پێشێل دەکات بەشێوە جیاوازەکان کە دەکرێت هاوسەرکردن بێت لەگەڵ کەسێکی ژندار، یان پێوەندیی خۆشەویستی لەگەڵ پیاوێکی ژندار‌دا دەبەستێت نە داکۆکیکاری مافی ژنە و نە فیمینستیشە.

بەداخی گرانەوە ئێمە پاش ١٣ ساڵ سەربەخۆیی هێشتا ئەو جۆرە کێشە شەرمەزارکەرمان هەیە کە دەبوو ئێستا لە بری ئەوەی باسی کێشەی ژنانی خۆ بەبەرگریکاری، بەهەموو بگەشتینایە بەچارەسەری کێشەی ژنانی بەش مەینەتی نەتەوەکەمان نەک بڵێین تۆی داکۆکیکار سەرەتا خۆت لە گوناهەکان پاکژکەرەوە بۆ ئەوەی خەباتەکەت سوودبەخش بێت.

ژن پێویستە لە خۆی بپرسێت ئایە خۆشی تاوانبار نییە لە چەوساندنەوەی خۆی و هاوڕەگەزەکەی؟ کە ئەو ئاکارە واتای چەوساندنەوەی دەروونی خۆی و ژنانی دی دەکات، لە خۆی بپرسێت بۆ پیاوانێک لە پێشمەرگایەتی و عەسکەری و هەڵوێستەکانی دیشدا خۆی کردووە و دەکات بۆ قوربانی بۆ هاوڕێکەی، ژن بۆ ناتوانێت ئەو قوربانییەی تێدا بێت بۆ هاوڕەگەز و هاوڕێ ژنەکەی لە کاتێکدا گەورەترین قوربانی بۆ پیاو دەدات؟

ئەوانەی سەرەوە کورتکراوەترین دەبڕینن لەو دیاردانەی ئەمڕۆ لەناو زۆرێک لە ژنان- ئافرەتان- خانمانی بەناو فیمینست یاخۆ داکۆکیکاری مافی ژن یان ڕۆشنبیردا دەردەکەوێت. ئەگەر لە ناوەڕۆکی ئەو خاڵانە وردبینەوە هێندە ساویلکە و ساکار و نەشیاون مرۆڤ شەرم لە خوێندنەوەی دەکات، بەڵام ئەگەر لەڕووی زانستی دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە، سەیری بکەین هەر یەک لەوانە جۆرەها نەخۆشیی دەروونی و گرێی خۆ بەکەم زانین

و لە هەمان کاتدا منی باڵا و ئەوی کەم و سادییەت دروستبوونی کارتوونی بەبێ توانای خۆی و جۆرەها نەخۆشیی دەروونی تر تێدا دەردەکەوێت ئیتر چۆن مرۆڤگەلێک شەرم لە هەبوونی ناکات لەنێو ئاکار و کردار و تێڕوانینیدا بێت بۆ خەباتی ژیان و مێژووی خۆی هەر یەک لە کەسانی ئەنجامدەری ئەو تەوەرانەش جۆرەها ناتەواویی ڕۆشنبیری و مەعریفی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و هۆشیاری و بارودۆخی دەروونیی هەیە کە پاڵنەرە بۆ ئەوەی بیکات بەخۆراکی ئەو جۆرە ڤایرۆسانە. بۆیە پێویستە کاتێک باس لەمانە دەکرێت لە لایەن هەر کەسێکەوە شەرم بکات بەفیمینست ناوی بهێنێت و نەیانخاتە خانەی فیمینستی و تەنانەت داکۆکیکاری مافی ژنیشەوە.

وەکو سەرەتا گوتمان پێویستە ژن - ئافرەت خۆی بخاتە نێو تاقیگەی هۆشیاری و دەروونیی خۆیەوە، خۆی تاقی بکاتەوە و بزانێت ئەو کێیە؟ ئایا هیچ کام لەو سیفاتانەی تێدا بوو کە ئاماژەمان پێ کرد؟! ئەگەر تێیدایە تا چەند دەتوانێت خۆی چارەسەر بکات و ئەو سیفەتەش وەکو یەکێک لە نەخۆشییە کوشندەکان بزانێت کە پێویستی بەچارەسەرکردنی لەبنەوە هەڵکێشان هەیە. ئەگەر ڕاست بوو لەگەڵ خودی خۆیدا، لەگەڵ ناخی خۆیدا گفتوگۆی دروست کرد و گەیشت بەدەرئەنجامی ڕاستەقینە دەتوانێت چارەسەریشی بکات و بەڵام ئەگەر بەپەنجەی غروور بەرچاوی خۆی سڕی و وایزانی هەموو ئەوانەی کردوویەتی و دەکات خەباتێکی ڕاستە، ناتوانێت بگات بەدەرئەنجامی ئومێدبەخش.

کاتێک ژن لەو تاقیگەدا دەفتەرەکانی خودی خۆی دەردەهێنێت، ئەو کات دەتوانێت ئامانجەکانی تر دەستنیشان بکات، لەوێوە هەوڵ بدات پڕچەکی هۆشیاری و مەعریفی بکات لەڕووە جیاوازەکانی ژیانەوە بۆ ئەوەی بەرەو بزووتنەوەیەکی فیمینستی و گوتارێکی ژنانە بچێت. سەرەتای پڕ چەککردنیش بەوە دەست پێ دەکات کە چۆن هەنگاوەکانی دەستنیشان بکات بەرەو فمینیزم، ئەو فیمینستیەی کە بۆ جیهانی کوردی



پێویستمان پێیەتی، کە بۆ دەرد و مەینەتیی ژنانی کورد ئەوانەی هەمیشە دەنگیان خراوەتە نێو سندووقێکی بەڕووکەش مۆدێرن و بەناوەڕۆک پاتریاکی و دواکەوتوون... هەنگاوەکانی ژنانی هۆشیار و فیمینست لە میکانیزمە سیاسییەکاندا سەرجەم دەرگا مەعریفییەکان دەبڕێت و ڕازی نابێت ئامێری بەڵێکار و جێبەجێکار بێت بەبێ ئەوەی لە زانستی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیری تێ بگات بەبەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی نوێ.

## پەیمانی کۆمەڵایەتی

کاتێک ژنانێک دەتوانن ئەو خاڵە قێزەونانە بەئامانج بگرن بۆ گەیشتن بەئامانج و مەبەستە خودییەکانی خۆیان و بەرژەوەندی خۆیان دەخەنە سەروو بەرژەوەندی مرۆیی و هەقیقەتەوە، جگە لەوەی ئەو پرۆسەیە خەونی ژنانی تێدا بەرهەم ناهێنرێت جگە لە خەونی نەزۆکی ئەو کەسانەی بەوتەکەی میکافیلی سەرسامن (وەکو ئاماژەشمان پێ کرد لەو وتەیەدا واتای نووچدانی هەردوو فاکتەری مۆراڵ و شارستانییەت بەرەو نەویبوون و لەناوچوون دەچێت، ئەو نووچدانەشی واتای لێک ترازانی پەیمانی کۆمەڵایەتی دەکات لەپێناوی بەدیهێنانی خود (الذات)دا. جگە لەوەی کاتێک شارستانییەت و مۆراڵ نووچ دەدەن ئیتر هیچ پانتاییەک بۆ مەبەستی باڵابوونی مافی مرۆڤ و ژن و پنتە سیڤیلییەکان نامێنێتەوە، کەواتە مرۆڤێک کە دەبێت بەهۆی نووچدانی شارستانییەت چاکتر وایە خۆی لە بانگەشەی ژیانی سیڤیلی و مافی ژن و بزووتنەوەی فیمینستی بەدوور بگرێت.

چونکە ئاستی پێشکەوتن و شارستانییەت، ڕێسا سیڤیلییەکان لە هۆشیارییەوە سەرچاوە دەگرێت کە متمانە دەخاتە سەر ڕەخنەگرتن لە خود پاشان لە دیاردەکان لەسەر ئاستی تاک و کارلێکەرەکانی، دەنا لە دەرەوەی ئەو بازنەیە پەیمانی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە مەترسی دۆڕانەوە.

بۆ نەدۆزانی پەیمانی کۆمەڵایەتی زۆربەی بیریاران لەنێو فەلسەفەدا پەیمانی کۆمەڵایەتییان وەکو شێوەیەکی گرینگ و سەربەخۆ و کاریگەر بەسەرجەم چڵەکانی تری فەلسەفەوە خستووەتەڕوو، بەتایبەت تۆماس هوبز زیاتر لە بیریارانی تر خۆی سەرقاڵی ڕاڤەکردنی کردووە بەڕادەیەک بەسەر چمکی دیموکراسیشدا بازی پێ داوە، لای هوبز پەرەپێدانی ئەو بیرۆکەیە بوو بەهۆی ورووژاندنی بیرۆکەی ئازادیی سیاسی، کەواتە بەبێ هەبوونی پەیمانی کۆمەڵایەتی چمکەکانی ئازادیی سیاسی و دیموکراسیش بێ واتا و ناوەڕۆک دەمێنێتەوە، چونکە لە بنەمادا ئازادی و دیموکراسی لەسەر بنەمای مۆراڵی و شارستانییەت بنیات نراوە، ئەو چمکە ئەخلاقییە مرۆڤ کاتێک هەڵی مژی بەرگێکی نوێی بەبەر دەبڕێت، لەبەرئەوەی کە سەدە کۆنەکان خواحافیزییان لێ کردووە و دەروونە پیسەکانیش نزگەرەی ئاسوودەیان تێدا نەداوە، ئەگەر ئازادی واتا هۆشیاری درککردنی مرۆڤ بێت بەمافی بەرامبەر و ئەرکی خۆی، یاخۆ ماف و ئەرکی (من) بۆ ماف و ڕێزگرتنی سەروەرییەکانی (ئەو) ئەوی ئازاد نەک کۆیلە، ئەوا کاتێک مرۆڤ درک بەو ڕاستییە دەکات کە شیرازەی پەیمانی کۆمەڵایەتی نەشێواو بێت و لە خانەی بایەخەکانیدا نەخرابنە پەراوێزەوە.

ئەگەر دیموکراسیش ئەو کەشوهەوا و ئازادییە بێت کە مافەکان و ئازادییەکانی (من) و (ئەو)ی کەنار نەکەوتووی تێدا بەرجەستە بێت، ئەوەشیان دیسان لەو کۆمەڵانەدا ڕوو دەدەن کە هۆبز ئاسا پەیمانی کۆمەڵایەتییان هێندە پیرۆز ڕاگرتووە کردوویانە بەئایکۆنەی ڕووناکییەکانی تر. کە دیارە جگە لە هوبز زۆربەی بیریارەکانی چەرخی ١٨ - ١٩ میتۆدەکانی خۆیان لەسەر بیری پەیمانی کۆمەڵایەتی تەژی کردووە. لەوانەش (جان جاک ڕۆسۆ، کانت، ستیۆرات مل... تاد).

ئێستای مرۆڤایەتی هێندە ئاڵۆز و لێک ترازاوە مەگەر جارێکی تر مرۆڤ خوێندنەوەی بۆ بوون هەبێت بەشێوەیەکی نوێ بگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفە جارێکی تر لە چوارچێوەی فەلسەفە و



تیۆرییەکاندا دای بڕێژێتەوە لەو ترسەی پێی بڵێن مرۆڤێکی نموونەییە، چونکە ئەگەر مرۆڤی نموونەیی ئەو مرۆڤە بێت لە چوارچێوەی ڕاست و دروست تێ هەڵکێشکردنی پەیمانە کۆمەڵایەتییەکاندا فەلسەفەی ژیان دابڕژێت، ئەو مرۆڤە براوەیە و ناووناتۆرە جیاوازەکانیش لای کۆمەڵ واتای هەرچی بێت ئەو ڕاناچەنێنێت. لەبەرئەوەی ئەو پێوەندییان لەسەر بنەمای زاڵم و زۆرلێکراو، بالا و نەوی، پەردەپۆشکردنی درۆ زەقەکان لە ئاستی مرۆڤایەتیدا دامەزراوە، واتا لەسەر جەدەلیەتی خەم و زوڵم دامەزراوە، لەسەر بنەمای یەکەی جیاوازی و فرەیی و بەربەرەکانی دامەزراوە، ژنیش بە بەربەرەکانی مەسەلەکانی ناباتەوە، بەربەرەکانی شەرعییەتی جیهانی پاتریاکییە، نەک جیهانی بەدیهێنەری خەونە بەرهەمێنەرەکان، بۆیە ژن پێویستی بەهاوپەیمانیی کۆمەڵایەتیی نوێ هەیە لەم قۆناغەدا بەشێوەیەک کە بنیاتی کۆمەڵێکی نوێی لێوە لە دایک بێت، ئەو بڕیارەش بەبێ هەبوونی هۆشیاری سەرچاوە ناگرێت.

## هۆشیاری لای فیمینست

مرۆڤ هەتا درک بەوە نەکات تەنیا بەهۆشیاری دەتوانێت خەونی ڕەوا بخاتە نێو شەرعییەتی مرۆییەوە، هەتا دڵنیا نەبێت هۆشیارییەکی دروستی هەیە بۆ خوێندنەوەی ڕاستییەکان هەتا شەپۆلی هۆشیاری نەگەینێت بەکەنارەکانی منداڵی و لەوێوە ڕەخنە لە زەردەخەنە کەوالیسدارەکانی گەورەیی ناکات، بەڕاستی هۆشیاری مرۆڤی فیمینست خاوەنی ئەو هۆشیارییە ڕاستەیە، ئەدی مرۆڤی خاوەن خوێندنەوەی زانستی، ویژدانی زیندوو، ئایدیای فەلسەفی، خەونی بەرهەمهێنەر، دنیای یەکسان و دادوەر و هۆشی ئاشتی بێت چۆن دەتوانێت بەبێ میتۆدەکانی هۆشیاری بگات بەو چمکە دەگمەنانەی کە لە جیهانی ئەمڕۆدا لەگەڵ گاز و ئەتۆمدا توێنرانەوە.

ژن ئەگەر بیەوێت فیمینست بێت ئەو فمینیستەی کە پێکەنینی

بەهەڵەکانی فیمینستەکانی جیهان دێت، جیهانبینی نوێی خۆی دەبێت بۆ جڤاکی کوردی، ڕەگەزەکانی ئایدیای پاتریاکی دەنێرێتە مۆزەخانەی شتە لەبیرکراوەکان. خۆی لەو ڕاستییە لا نادات کە لە جۆرەکانی هۆشیاری تێ بگات لە دوو ئاستدا بەرجەستە بوون، ئەوانیش بریتین لە هۆشیاریی ئاستی ڕەمەکی (العفوي) لەگەڵ هۆشیاری ئاستیی قووڵ (ئایدۆلۆجی).

ئاستی ڕەمەکی کە دەتوانرێت پێشی بگوترێت ئاستی سایکۆلۆجیی کۆمەڵایەتی کە هۆشیاریی مرۆڤ و خوێندنەوەی دەگرێتەوە بۆ ڕووداو و دیاردە ڕووکەشەکان. بەرجەستەکردنی ئەو خووەی کە لە داوونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و توێژە کۆمەڵایەتییەکاندا پەیڕەوی دەکەن، ئەو ئاستەش گوزارشت لە پێوەندیی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندییە خودییەکان و ژیانی ڕۆژانە و دوور و نزیکی لە خەڵک دەکات بەرەچاوی پێوەندیی ڕەهەندە کولتووری و جوگرافی و چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان.

دووەم ئاستی قووڵە (ئایدۆلۆجی) هەندێکیش بەنوێخواز ناوزەدی دەکەن. ئەو هۆشیارییە کە لە ڕووداوەکان و دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری و ڕۆشنبیرییەکان قووڵ دەبێتەوە و خاوەنی بیر و بۆچوون و ڕاڤەکردنی تایبەتی خۆی دەبێت بەرامبەریان بەبێ ڕەچاوکردنی فاکتەرە تەقلیدییەکان کە لە باری هۆشیاری ڕەمەکیدا هەیە.

مرۆڤی خاوەن بیروڕای جیاوازیش واتا مرۆڤی خاوەن تایبەتمەندی، مرۆڤی خاوەن تایبەتمەندیش ئەو مرۆڤەیە کۆدی لایەنە شاراوەکانی ژیان و یاسا و ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان و چۆنیەتی پێشکەوتنی هەیە، هەبوونی هۆشیاریی ئایدیۆلۆجی واتا زەنکردنی میکانیزمی سەرجەم بیر و چمک و تیۆر و باوەڕەکان دەتوانێت ئەم جۆرە مرۆڤانەش ناویان بنرێت نوێنەری کۆمەڵ چونکە زێتر توانای بەرهەمهێنانی خەون و داهێنانیان هەیە، دەتوانرێت ئومێدی دواڕۆژی فەرد و کۆمەڵی نوێیان لێ بکرێت چونکە ئەمانە فەلسەفەیەکیان هەیە بۆ ژیان جیاواز لە باو.



لە ئەمڕۆدا کە ڕۆژی شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆجییە، ئایدۆلۆجیا و هۆشیارییە ساکارەکان هەڵگری وەڵامی پرسیارەکانی ئەم سەردەمە نین، بۆیە گەڕانەوەی بۆ هۆشیاریی فەلسەفی یەکێکە لە خواستەکانی ئەم سەردەمە، لەنێو فەلسەفەشدا زیندووکردنەوەی بەشە مردووەکانی پرسی فەلسەفی، چونکە ئەمڕۆ جیهان گۆڕاوە بەجیهانی فیکر و چمک و بیروباوەڕەکانیشەوە.

لەگەڵ ئەم هەموو چمکە نوێیەدا ژنی کورد زۆرێک لەوانەش کە خۆیان بەڕابەری مەسەلەکانی ژنان دەبینن هێشتا هۆشیارییان لە ئاستی یەکەمە کە دەستنیشانمان کردووە واتا خاوەنی هۆشیارییەکی ڕەمەکییە و خوێندنەوەی ڕووکەشانەی هەیە بۆ دیاردە و ڕووداوەکان و ناتوانێت لەو چوارچێوەیە دەرچێت کە عەقڵە تەقلیدییەکان بۆیان داڕشتووە، کارەساتیش لەوەدایە هۆکارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئازادی لە کاتێکدا هۆشیاری ئازادی دروست دەکات و دەیگەیەنێت بەو ئاستەی کە پێویستە هەبێت و گونجاو بێت لەگەڵ ژیانی مرۆڤێکی ئاسایی کە بیەوێت بەکەرامەتەوە بژی. ئەو کارەساتانەی ئەمڕۆ ژنانی ڕۆژئاوای تێ کەوتوون، ئەو ئازادییە لەناکاوە بوو کە دەرئەنجامی شەڕەکان بەر لە هەبوونی هۆشیاری تەواو بەمرۆڤیان بەخشی بۆیە ژن کاتێک هۆشیاری گرێ دەدات بەهەبوونی ئازادی و یاساوە لەناو هۆشیاریدا ئەو بۆچوونەی هەیە، چونکە عەقڵ ئامرازی مەعریفەیە وەک زانراویشە ئەوەی خاوەنی توانای بەکارهێنانی مەعریفەکانی نەبێت ناتوانێت ببێ بەلایەنێک لە بەرهەمهێنانیدا. مەعریفەش شێوازی هەبوونی هۆشیاری دەگرێتەوە، کە مەعریفە فەلسەفییەکان هۆشیاری دەکەن بەپێنج بەشەوە ئەوانیش لایەنی:

١- هۆشیاریی خود.

٢- هۆشیاریی ئەندێشە.

٣- هۆشیاریی ئیرادە.

٤- هۆشیاری مەعریفە.

٥- هۆشیاری هەڵچوونەکانی مرۆڤ(١٩).

وەکو دەبینین یەکێک لە لایەنەکانی هۆشیاری عەقڵە و عەقڵیش ئامرازی فیکرە کەواتە فیکریش دەرککردنە، دەرککردنیش واتە زانینی پێناسەی دەوروبەر، لە سەرەتاوە هەتا مرۆڤ پێناسەی خۆی دەسنیشان نەکات ناتوانێت لە واتای پێناسە تێ بگات تا متمانەی بخرێتە سەر بۆ دەستنیشانکردنی پێناسەی شتەکانی دەوروبەری. ژنی کورد پێویستە لەرووی هۆشیاری و فیکرییەوە بگات بەئاستێک پێناسەیێک بۆ خۆی دەستنیشان بکات. ئەنجا پێناسەی دەوروبەری و پێناسەیێک بۆ مەسەلە پڕ جەنجاڵییەکەی بدۆزێتەوە، کە من لای خۆم ئەو پێناسەم ناوناوە فیمینست یان ژنناسی، ژنناس و فیمینستی کوردیش پێویستە سەرجەم ئەو لایەنانەی هۆشیاریی تێدا بەرجەستە بێت لە هۆشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و لایەنە دەروونییە پێوەندارەکانیش بەو تەوەرانە، دەنا ناتوانێت بگات بەئامانجەکانی. هەوڵەکانی دەبێت بەجوینەوەی بنێشتی ژنانی ڕۆژئاوای سەدەکانی ناوەڕاست.

## سیاسەت و زانستە جیاوازەکان

مرۆڤێکی سیاسی ئەگەر ئاگاداری زانستەکان نەبێت کە ڕاستەوخۆ پەیوەستی زانستی سیاسین، وەکو مرۆڤێکی دیندارە کە نوێژ دەکات تەنیا لەبەرئەوەی دایک و باوک وایان ڕاهێناوە نوێژ بکات، ئەویش پەیڕەوی دەکات بەڵام نازانێت قیبلەی لە کوێیە یاخۆ بۆچی نوێژ دەکات. ئەوە ئەو کارەساتەیە زۆریک لە سیاستمەدارانی کوردی تێدایە کە ژنیش پاشکۆیانە. کە هەر زۆرێک لەوانە بەهۆی بارودۆخێکی تایبەتەوە، شەڕی عەشایەرگەری، نەگەیشتن بەخواستی خۆی بەرامبەر بەو کچەی کە خۆشی ویستووە، ویستی ژنهێنان و ڕەتکردنەوەی لای دایک و باوک، ڕاکردن لە سەربازی کردن و چەندین نسکۆی کۆمەڵایەتیی تر زۆرینەی



سیاسەتمەدارانی ئەمڕۆی جیهانی دەسەڵاتی کورد و سیاسیی گەیاندووە بەشاخ و بەبێ خواستی خۆیان کە بیریان چووبێت بۆ لای ئازادی ڕۆژێ لە ڕۆژان، ئەمڕۆ هاتوونەتە سەر عەرشی دەسەڵات، هەر لەسەر ئاستی شاخ و کولتوورەکانی شاخ و سیاسەتی شاخ مامەڵەیان لەگەڵ شارستانییەت و سیاسەتی نوێی شاریشدا کرد.

ئەو دیاردەیە لە دەرەوەی پلەوپایەی ژنیش نەبووە، ژنانێک کە بەهۆی لێپرسراوێتییە کۆمەڵایەتییەکەیان و ئەو داوونەریتەی کە هەیە (پیاو لە هەر کوێ بێت پێویستە ژنیش دوای کەوێت) لەو ڕوانگەوە کۆمەڵێک ژنی زۆر گەیشتن بەشاخ و ئەرکی کۆمەڵایەتیی باوی خۆیان بەجێ هێنا. ئیتر لەوێ سیاسەتیان کردبێت یان نە قسە لەسەر ئەوانە نییە، چونکە دەکرێ کاری باش و هەڵوێستی گەورەیان هەبووبێت، بەڵام هەڵبژاردنی زۆربەیان بۆ ئەو خەبات و سیاسەتە هەڵبژاردنێکی خۆویستانە و زانستییانە نەبووە بۆیە کاتێک گەڕانەوە بۆ شار و ئازادی و سیاسەتی نوێ (کە دڵنیام زۆربەیان مافیان خورا)، بەڵام ئەوانەیان کە بەهۆی کەسوکار و مێرد و برایان لە شاردا لە پۆستی بەرزدا بوون، پۆستەکان و ئەرکی سیاسییان پێ بەخشرا. ئەوانیش بارودۆخیان لە پیاوەکان باشتر نەبوو و نابێت، هەر بەو شێوە باوە چوونە سەر کورسیی دەسەڵاتیش بۆیە ئاکار و مامەڵەیان بەهەردوو لا زۆر دووربوو لە مامەڵەی زانستییانە و ژنانیش بەهەمان شێوەی هەڵەکانی ئەوان شەڕی دەسەڵات و شەڕی حزب و شەڕی تەکەتول و ناوخۆیان دەکرد. ئەو ئاکارەش دوورە لە مامەڵەی خەڵکانێکی کامڵی سیاسی یاخۆ هۆشیار لەبارەی زانستە سیاسییەکان و گرێدراوی بەزانستەکانی ترەوە، ڕاڤەکردنی ئاکاری هەریەک لەوانەش لەناو زانستە جیاوازەکاندا نەنگیی دەروونی کۆمەڵایەتی گەورە بەرهەم دەهێنێت بۆ مێژوویان، بەڵام ئەوان سیاسەتیان تەنیا بەئامانجی گەیشتن بەدەسەڵات گرتووە، بێ ئاگان لە پێوەندیی سیاسەت بەو زانستانەوە.

## سیاسەت و زانستی سۆسیۆلۆجی

ئەوانەی بەشێوە تەقلیدییەکە لە زانستی سیاسی گەیشتوون پێیان وایە زانستی سۆسیۆلۆجی (کۆمەڵایەتی) لەو سۆنگەیەوە نزیکە لە زانستی سیاسییەوە چونکە هونەرێکە لە هونەرەکانی ڕێکخستنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان.

تیۆرییەکانی ئۆگۆست کۆنت کە بنەمای زانستی سۆسیۆلۆجین وای نیشان دەدەن کە زانستی کۆمەڵایەتی وا هاتە پێشەوە وەکو ئەوەی بیەوێ زانستی سیاسی بسڕێتەوە و سۆسیۆلۆجی وەکو زانستێکی بنیاتنەری بەهێز جێگەی بگرێتەوە، بەتایبەت کە شیتەڵکردنی ڕۆحی حەقیقەتی لەخۆ گرتووە کە پابەندی هەستی کۆمەڵایەتییە.

لە دەرەوەی پێناسەکانی کۆنت ئەگەر بڵێین زانستی سۆسیۆلۆجی چۆنێتیی ژیانی مرۆڤە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە ئەوا ئامرازەکانی زانستی کۆمەڵایەتی بچووککراوەی ئەو مەسەلەیەن وەکو ئەوەی پۆلێنی بکات بۆ کۆمەڵایەتیی پێشکەوتوو و دواکەوتوو، زانیار و نەخوێندەوار، دەوڵەمەند و هەژار و... هتد.

لەمیانەی ئەو جیاوازییانەوە ئەو زانستە هەوڵی داوە یاسا کۆمەڵایەتییەکان ئاشکرا بکات کە دەکرێن بەدوو بەشەوە. ئەوانیش:

١- یاسای کۆمەڵایەتیی گشتی.

٢- یاسای کۆمەڵایەتیی تایبەتی.

پێم وایە ئەو جیاکردنەوەش و زانینی ڕاست و هەڵەکانی و بەرەوپێشبردنی زیاتری بەشە پێشکەوتووەکە و پێشخستنی بەشە نائەکتیڤەکەیەتی. لێرەوەیە زانایان زانستی کۆمەڵایەتی بۆ ئەو کۆمەڵە یاسا فەرمانڕەوایە ناوزەد دەکەن کە کۆنترۆڵی ژیانی مرۆڤ دەکەن لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە.



بەگەڕانەوە بۆ کۆنت پێویستە چەقی بایەخدان لە دەوڵەتەوە بگوێزرێتەوە بۆ مرۆڤایەتی کە کۆنت بەکۆمەڵە مرۆڤێکی ڕابردوو و داهاتوو و ئێستا ناوزەدی دەکات. کۆنت پیرۆزییەکانی ڕابردووی مرۆڤایەتی ناخاتە پەراوێزی هیچەوە و پێی وایە پێوەندی لە میانەی نەوەکانەوە هەیە وای دەبینێت کە ڕێژەی ئەو مردووانەی هەتا ئێستا کارگەرییان لەسەر نەوەکان هەیە وەکو ئەوەی زیندوو بن هەمیشە لە زیادبووندایە.

ئەو بۆچوونەی کۆنت بۆ کۆمەڵگا ڕۆژهەڵاتییەکان بەتایبەت ئەو کۆمەڵانەی کە هێشتا دوورن لە زانستە تەکنەلۆجییەکان بەتەواوی ڕاستن، بەتایبەت لە داوونەریت و مەسەلەی نەتەوەیی و ئاینییەکاندا، هەروەها بۆ ماوە زانستی و فەلسەفییەکان کە ئەمەش هەندێ جار شۆڕشێک لەنێو نەوەکاندا هەڵدەگیرسێنێت.

ئەو حاڵەتە لە جیهانی کوردیش بەدەر نییە، بەڵام کێشەی ئێمەش جیاوازە لەگەڵ نەتەوەیەکی ڕۆژئاواییدا کە دەکرێت ژمارەیەکی زۆری مردووەکانی خاوەنی سەرجەم بیروباوەڕ و چمکە فەلسەفییە ژیارییەکانن، ئێمەی کوردیش سەرجەم ئەو چمکانەمان لە مردووەکانی ئەوانەوە بۆ ماوەتەوە، چونکە لە بنەمادا ئێمەی کورد کولتووری مردوو و زیندوومان کولتوورێکی داڕزاو بەداوونەریتی دواکەوتوو و نەخوێندەوار و باوەشکردن بەچمکە ئاینییەکان بەر لە تێگەیشتن و بەشێوەیەکی کوێرانە، شۆڕشی دۆڕان، هەموو ئەو چمکانەی کە لە ڕۆژئاوا دەچنە پەراوێزەوە لە پۆلێنەکەی کۆنت جێگەیان نابێتەوە.

ئەمڕۆی جیهانی نوێ و تەکنەلۆجی نەک نەمری مردووەکانی کوشتووە، بگرە ئێستا و داهاتووی زیندووەکانیشی لە زۆر ڕووەوە بێ ئومێد کردووە. تەکنەلۆجی بەشێوەیەک تێکەڵاوی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤی ڕۆژئاوایی بووە، زۆر ڕووی ژیانی لێ شێواندووە و ئەو شیرازانەش لێک نەترازا بوون، زانستی تەکنەلۆجیا لێکی ترازاندن و بەرامبەر چارەسەرکردنی هەندێ کێشەی تر، واتە شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆجی تێکەڵاوی هەندێ

زانستی کۆمەڵایەتی بوو بەئاستێک هەندێ کێشەی بۆ چارەسەرکردن و هەر بۆ ئەو چارەسەرکردنە کۆمەڵێ کێشەی گەورەی بۆ دروستکردن و کاریگەریی نێگەتیڤی کردە سەر ڕێسا و یاساکانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییان وەکو ئەوەی بەهۆی هەندێ تەکنیکی نوێ بۆ ئاژەڵ جێگەی بەمرۆڤ لێژ کردووە لە نەشتەرگەریی پزیشکیدا کە ڕووی داوە ئەندامی ئاژەڵێک بۆ مرۆڤ دابنێن، یاخۆ کەسێک تەنیا ئاژەڵێک لە ماڵەوە ڕاگرێت چ ژن بێت یاخۆ پیاو لە بری هاوسەر پرۆسەی سێکسی لەگەڵ ئەو ئاژەڵە ئەنجام بدات بەهۆی ئەو هەموو وێنە سێکسیانە لەگەڵ ئاژەڵدا بڵاو دەکرێنەوە جگە لە کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی دی، یاخۆ پەراوێزخستنی ڕەگەزی ژن لای پیاو و پیاویش لای ژن بەهۆی ئەو هەموو ئەندامە سێکسی دروستکراوەی کە جێگەی ژن بۆ پیاو و پیاو بۆ ژن دەگرێتەوە و بەکاری دەهێنێت و پێویستیان بەیەک نابێت، یاخۆ نەشتەرگەریی گۆڕینی ڕەگەزی مرۆڤ لە نێرە بۆ مێ و پێچەوانەکەی، مەسەلەی دروستکردنی مرۆئامێر و کۆپیکردنی مرۆڤ و منداڵی بۆڕی یان کڕینی سپێرم لە بانکی سپێرم(٢٠)، ئەو چاودێرییانەی کە لە ڕێگەی تەکنەلۆجیا و ئەنتەرنێتەوە چاودێریی مرۆڤی پێ دەکەن و کاریگەریی نێگەتیڤی کۆمەڵایەتییان لێ دەکەوێتەوە.

بۆیە ژنی کورد پێویستە زۆر بەوریاییەوە مامەڵە بکات و بە وشیاری لە ئازادی تێ بگات، وانەزانێت ژنانی ئەوروپا گەیشتوون بەسەرجەم مافەکانیان و کێشە کۆمەڵایەتییەکانیان لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ژنی کورد زیاتر نین. هەر لە سەرەتای مێژووی فیمینستی ڕۆژئاواشەوە هەتا ئەمڕۆ دەیان ژنی لێهاتوو خۆیان بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان تەرخان کردووە هێشتا بەهەزاران کێشە یەخەی گرتوون و ڕۆژ بەڕۆژیش کێشەکانیش ڕوو لە زیادبوون دەکەن، لەوانەش Margaret Sanger مارگرێت سانگەر(٢١) ١٨٧٩ - ١٩٦٦ برینپێچێکی ئەمریکییە، یەکێک بوو لەو ژنانەی وازی لە کارەکەی خۆی هێنا بۆ ئەوە پزیشکەکان بدوێنێ و



بگات بەچارەسەری بنەڕەتی بۆ کۆنترۆڵکردنی منداڵبوون، خەڵکانی هەژاری نیویورک لە میانەی هەوڵەکانی ئەم خاتوونە لە کۆنترۆڵکردنی سکپڕی تێ گەیشتن، هەر ئەویش یەکەم ئافرەتە کە (عیادە)ی کۆنترۆڵکردنی منداڵبوونی کردووەتەوە پاش ئەوەی ڕەزامەندیی کۆنگریسی ئەمریکی بەدەست هێناوە. جگە لەوەی لە ساڵی ١٩٢١ سەندیکای کۆنترۆڵکردنی منداڵبوونی دامەزراندووە گۆڤارێکیشی بەهەمان ناو بۆ هەمان مەبەست لە ساڵی ١٩٢٩دا دەرکردووە، زۆربەی زانیارییەکانی منداڵبوون و کۆنترۆڵکردن و لەباربردن لە میانەی ئەو سەندیکایە و گۆڤارەوە هاتنە ئاراوە. سانگەر یەکێک بوو لەو ژنانەی کە خزمەتی کۆمەڵایەتیی گەورەی بەمرۆڤایەتی و ژنی ئەمریکی کرد، بەتایبەت چینی هەژاران. هەر لەو کارە مرۆییەش بەردەوام بوو تا سپتێمبەری ١٩٦٦ کە گیانی بەمەرگ سپارد.

هەر بەهۆی ئەو خزمەتگوزارییە گەورانەی سانگەر و ئارامگرتنی لەبەر زیندانی و مەینەتییەکانی بۆ گەیاندنی ئامانجەکانی، ئەمڕۆ لە ئەمریکادا سەنتەری جیهانی مارگرێت سانگەر دامەزراوە M. S. C. I لەو سەنتەرەدا بایەخ بەپلانی باوکایەتی و نەخۆشییە زایەندییەکان و هەڵبژاردنی توخمی زاوزێ و یەکسانیی ژێندەری لە هەموو جیهاندا دەدرێت.

جگە لە سانگەر لە کۆندا ئیزابێل کادی و ئەلیس پادل دیسان بەخەباتگێڕی گەورەی لایەنی ژنان ناسراون. لە ئێستاشدا بەسەدان ژنی بەتوانا و ئاکادیمی خۆیان بۆ ئەو بوارە تەرخان کردووە بەشێوەیەکی زانستییانە لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەکەیان دەکۆڵنەوە.

بەڵام ئەگەر سەیری کوردستان بکەین پرۆفشناڵی نییە و ژنێک بەو هەموو کەموکوڕییەی پێشتر باسمان کرد دێتە نێو مەیدانی سیاسی بەناوی ژنانەوە دەم لە هەموو مەسەلەکان و کێشەکان وەردەدات، لە ڕێگەی چەند دێڕێکی خوازراوەوە باس لە سەرجەم کەموکوڕییەکان دەکات، ئەو جۆرە خەباتەش دەکات بەمنەت بەسەر ژنانی بەش مەینەتییەوە.

ئەو بۆشاییەی کە باسمان کرد ئەمڕۆ بەهاتنە ئارای ژنانی فیمینستی خۆکۆنترۆڵکەر بەهەموو زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان و پرۆفشناڵ لەو بوارەدا پڕ دەبێتەوە، ئەو ژنانەی کە تەنیا خۆی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان بکات نەک سەرجەم تەوەری کێشەکان و بەشێوەیەکی زانستی بگات بەدەرئەنجامی:

١- سەرجەم کەموکوڕییەکانی ژنانی کورد، هۆ و چارەسەر و دەرئەنجانە زانستییەکانی.

٢- ڕاڤەکردن و نیشاندانی مەترسییە نوێکانی ڕۆژئاوا و کاریگەری لەسەر ژیانی ژن و ڕێگەچارە بۆ کۆنترۆڵکردنی لایەنە نێگەتیڤییەکان و دزە نەکردنی بۆ نێو جیهانی پڕ جەنجاڵ و مەینەتی ژنی کورد و لای ژن ڕوون بێت کە بەبێ ڕێگەگرتنی زانستی سەرجەم هەوڵەکانی دەچێتە بازنەی بانگەشە نەک چارەسەری بابەتییەوە. ئەوەش پێویستی بەکردنەوەی سەنتەرێکی زانستی هەیە کە ژنان تێیاندا بەشێوەی زانستییانە هەریەکە بەپێی بواری خۆی لە بوارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەروونی و ئابووری و کولتوورییەکان لە کێشەی ژنی کورد بکۆڵێتەوە.

## سیاسەت و زانستی سایکۆلۆجی

پێوەندیی سایکۆلۆجی و سیاسەت دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی فیکری مرۆڤ، واتە کەوتووەتە پێش دەرکەوتنی لایەنی تیۆری سەبارەت بەهەردوو چمک. بەگەڕانەوە بۆ ئەرستۆ بۆمان دەردەکەوێت پۆلێنی سایکۆلۆجیا و ڕامیاری و ئابووری وەکو زانستە پراکتییەکان دەکات. لەو پۆلێنەوە دەگەینە پۆلێنی پێناسەی بۆ فاکتەرەکانی تر کە هاوکاریی زانستی دەروونی دەکەن بۆ لێکۆڵینەوە، لەوانە ئەرستۆ پێی وایە (ئەخلاق) زانستی لێکۆڵینەوەی کردە کەسییەکانە، (ئابووری) زانستی بژێوی ژیانە سیاسەتیش زانستی فەراهەمهێنانی دەوڵەتە، بەڵام دەرئەنجامی ئۆرگانی ئەو پێوەندییە دەگەڕێتەوە بۆ پێویستیی زۆری سیاسەت بەهەر فاکتەرێک



و هەر کارێک کە ئاسانکاریی پێوەندیی بۆ بکات کە زانیاری بۆ وەدەست بهێنێت لەو جۆرە زانیارییانەی پاڵپشتی چالاکییەکان و ئامانجەکان دەکات.

هەوڵەکانی یونگ و پاشانیش فرۆید، زۆریان سەبارەت بەزانستە سیاسی و زانستە دەروونییەکان بەگەلانی جیهان گەیاند. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توێژینەوەی زانستی ڕاستەقینە لەبواری سایکۆلۆجی سیاسیدا، لە وڵاتە یەکگرتووەکانەوە سەری هەڵدا ئەو کاتەی پاش شەڕی جیهانی دووەم بیریارانی بواری زانستی لە ئەوروپاوە هەڵهاتن بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکان و لەوێ نیشتەجێ بوون. لەوێ دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی و سیاسی سەبارەت بەفاکتەرە جیاوازەکانی سایکۆلۆجیا و سەرەتا دەربارەی (ناهۆشیاری)ی کۆمەڵایەتی و لە میانەی هۆش و دەرەوەی هۆشیش و پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ناهۆشیاری گەیشتن بەدەستنیشانکردنی دۆست و دوژمنەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان، لەپێناوی بەرجەستەکردنی زانستی دەروونی وەکو زانستێک میتۆدی پزیشکی خۆی هەیە، لێرەوە بوو جۆرەها دەرمانی دەروونی دۆزرایەوە، لە میانەی ئەو داهێنانەوە زانستی دەروونی هەولّی ڕێکخستنی ئەخلاقی بۆ نێو بەشەکانی بدۆزرێتەوە بەتایبەت بۆ زانستی سیاسی و، یەکەم پرەنسیپی ئەخلاقی ئەو زانایانە دەربارەی زانستی سیاسی ئەوە بوو کە ڕێگە لە کۆمەڵ و نەتەوەکان بگیرێت کە ئازادییی خۆیان لەسەر بنەمای ئازادی تاک و کۆمەڵ و نەتەوەکانی تر بەدی بهێنن.

لێرەوە واز لە وتەی تیۆریی زانایانی جیهان دەهێنین و ڕوو دەکەینە جیهانی کوردی چونکە هەموو تیۆرییەکانی جیهان بەرامبەر بەجیهانی کوردی لەوێدا کۆتایی پێ دێت کە زۆربەی تاک و کۆمەڵ و گرووپەکان دەیانەوێ ئازادیی خۆیان لەسەر بنەمای ئازادیی کەسانی تر بەدی بهێنن. لێرەدا چرکە ڕووناکەکانی کورد دەگۆڕێت بۆ تاریک و تێڕوانینێکی چاکسازی تێدا دەرناکەوێت، لە ماڵی کوردی هەر دەسەڵاتی کوردی

هەمیشە مایەی داگیرکاری ئازادی و هۆش و بیروباوەڕی تاک و کۆمەڵی کوردی، نانەوەی ئاژاوە و دووبەرەکی و بانگەشەی دووفاقی بووە لەناو کورددا، هەمیشە لێپرسراوی یەکەم ئازادییەکان و مافەکانی لێپرسراوی دووەمی داگیرکردووە و دووەمیش هی فەرمانبەرەکان و فەرمانبەرەکانیش مافی هاووڵاتییان و ئەوانەی دەچنە لایان بۆ جێبەجێکردنی کارەکانیان لە دابونەریتی کوردا بەخواستی گەورە ئازادی بچووک دەستنیشان دەکرێت. هەمیشە بچووک جێبەجێکاری خواستی گەورەیە، ئەوی بچووکیش هەمان پرۆسەی ئەنجام دەدا بەسەر لە خۆی بچووکتردا لە هەمووشیان زەقتر ئەگەر ئەو بچووکە نێر بێت ئەوا بۆی هەیە ئەو پرۆسەیە بۆ سەر مێینەکانی ناو خێزانەکەیدا ئەنجام بدات چەندە لەخۆشی گەورەتر بن... چونکە هەمیشە حیسابی ناتەواو بچووک بەڵێکار بۆ ژن دەکرێت. ئەم پرۆسەیە دایکیش دەردە دەروونییەکانی خۆی کە مێرد و کۆمەڵ و باوک بەسەریاندا سەپاندووە و پراکتیزە کردووە، پراکتیکی دەکات بەسەر کچەکەیدا و کچەکەشی بەسەر لەخۆی بچووکتردا و بەو شێوەیە ئەم بازنەیە هەمیشە بەردەوامە و بەهیچ جۆرێ ئازادیی خواست و مانێک لە نێو خێزانی کوردیدا بەدەر نابێت لە خواستی داگیرکاری تاکتیکی لەخۆ گەورەتر وەکو تەمەن یاخۆ وەکو ئەو ڕەمزەی داوونەریت باوەڕی پێیەتی، ڕۆژ بەڕۆژیش ئەو دەردە کۆمەڵایەتی و دەروونی و سیاسییەش لە تەشەنە دایە... چونکە ئاوێک لە سەرچاوە ئەسڵییەکەوە بێتە خوارێ لە هاویندا وشک ناکات. ئەو پیاوەی لای لێپرسراوەکەی ئازادی و مافی پێشێل کراوە و دێتە ماڵەوە هەمان کردە لەگەڵ خێزانەکەیدا دووبارە دەکاتەوە.

ئەم شێوەیە جیهانی کوردی لە تاقیگەی تیۆری زانستی دەروونی و پابەندبوونی بەزانستی سیاسی و دەسەڵات هیچ بەدەست دەهێنێت و زانستی دەروونی تەنیا بۆ نێگەتیڤەکانی وەکو سیخوڕی دەرگا داپلۆسێنەرەکانی بەکار دەهێنن.

بەهەموو پێوەرەکانی زانستی دەروونیش مرۆڤە دیکتاتۆرەکان هێندە



کاریگەرییان بۆ سەر قوربانیان هەیە کە هەموویان دەگۆڕن بۆ دیکتاتۆری بچووک، بەم شێوەیە جیهانی کوردی پڕ کراوە لە دیکتاتۆری گەورە و بچووک.

ئومێدی دووەممان کە ژنانێکی ئازادیخواز و ئەوانەی خۆیان تەرخان کردووە بۆ کێشەکانی ژنان ئەوانیش لە ١١ خاڵی ڕابردوو زۆریان لانی کەم دانەیەکیان بوونی هەیە تێدا، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردایەتی بانگەشەکانی ژنیان هەڵبژاردووە و خۆشیان لەو نائارامی دەروونییە سەختەدا دەژین کە نەیانتوانیوە خۆیان چارسەر بکەن... ئەو سیاسەتە ناتەواو و ڤایرۆساوییە دژە وای کردووە سیاسەتێکی نەخۆش کە خۆی توانای چارەسەرکردنی خۆی نییە بەرجەستە ببێت، هەر سیستەم و پەیڕەو و پرۆگرامیش توانای خۆ چارەسەرکردن و خۆ نوێکردنەوەی نەمێنێت ناتوانێت بەرەوپێشەوە بڕوات و کۆمەڵ بگۆڕێت و ببێت بەهێمای ڕێکخەری ئەقڵانی کۆمەڵایەتیی دروست نەک هەڵگەڕانەوەی کۆمەڵ بۆ کۆمەڵێک نەخۆشیی پڕ گرێ.

بۆیە دڵنیام کە تەنیا ئایدیایەکی فیمینستانە دەتوانێ تیۆریی ئێمە و کۆمەڵە نەخۆشەکە، ژن ڕزگار بکات، چونکە وەکو ئاماژەمان پێ کرد ئەو فیمینستەی ئێمە باوەڕمان پێی هەیە ئەو مرۆڤەیە بەشێوەیەکی زانستی لە دیاردەکان دەنوارین و دەرئەنجامەکانیشی دەستنیشان دەکات، مرۆڤێکیش بەشێوەی زانستی جوولایەوە واتا ڕەچاوی ماف و ئازادی دەکات، واتە ویژدانی لەسەروو هەستیەتی، واتا هۆشیاری کە عەقڵ بووە بەهۆکارێک بۆی فیکر و خواستی کۆنتڕۆڵ کردووە، تەنیا ئەم جۆرە مرۆڤەش کە فیمینستە، فیمینستناس یاخۆ دەتوانێت ژنناس بێت، کۆمەڵناس، دەروونناس بێت لە چوارچێوەی خواستی مرۆڤەکاندا بەرهەمێکی دروست بچێنێت، چونکە بەهەبوونی فیکری مەعریفی و خواستی مرۆڤدۆستانە ئەو خواستە دەگوێزرێتەوە بۆ چالاکی و چالاکیش دەبێت بەبنەمای چاکسازی، ژنی فیمینست ئەگەر سیاسەتیش نەکات بۆ خۆی خاوەنی دەسەڵاتێکی لە سیاسەت گەورەترە، چونکە بەپێی ئەو هەنگاوە زانستییانە بۆ ئەو

فیمینستەی لە خۆیدا بەرجەستە دەکات دەزانێ فیمینزم بۆ خۆی ئایدیالۆجیایەکی گەورەیە، کە هەوڵ دەدات کەموکورییەکانی کۆمەڵ و سیاسەت و کولتوور ڕێک خاتەوە و ببێ بەڕێکخەرەکی ئەخلاقی دروست بۆ چینی ژنان چۆن دەزانێت چینێکە کاریگەریی گەورەی لەسەر چینەکانی تر و سەرجەم میکانیزمە ڕێکخراوەکانی تری کۆمەڵ هەیە، دەبێت بەچاودێری ڕاستکردنەوەی هەڵەکان، چونکە ژنی فمینیزم ئەو ژنەیە دەزانێت و هەنگاونانی سیاسی هەنگاوێکە لە بۆشاییدا دەمێنێتەوە ئەگەر لەسەر بنەمایەکی فیکری، زانستی، و ڕۆشنبیری، ئەخلاقی فیمینستی دانەمەزرابێت، ئازادیی فیکر و ئازادیی توێژینەوەی زانستیش ئالییەتی کارکردنیەتی.

## کاریگەریی ئابووری و ژنانی فیمینست

ژیان بەشێوەیەکی گشتی بەپێی یاسا سروشتییەکان دەگوزەرێن، بەڵام هەمیشە مرۆڤ هەوڵ و کۆششەکانی لە چوارچێوەی یاسا کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکاندا چڕ دەکاتەوە، بەهەموو پێوەرەکانیش هیچ جوولەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناچێتە پێشەوە بەبێ جوولەی ئابووری بەهێز یان لانی کەم گونجاو، کەواتە هەر چالاکییەک جوولەی ئابووری نەبێت بەپاڵپشتی ئیفلیجە، هەر بواری ئابووریش دەستنیشانی دەکات کە ئابووریی نەتەوەیی واتە یەکەی کۆمەڵایەتی یان کۆمەڵ بەگشتی کە دەبێت بەتەواوکەری کەسایەتیی نەتەوە و لەوێوە کۆمەڵ بەسەرجەم لاشەکەی و تاکیش بەخوێنبەرەکانی... بەو پێیە ئەگەر تاکێکی کۆمەڵ لەڕووی ئابوورییەوە بێ توانابوو خوێنبەرێکی ئەو لەشە کە نوێنەری سەروەری و قەوارەی نەتەوەیییە نەخۆشە، ئەگەر گرووپێکی بێ دەرامەت بوو واتە ئەندامێکی لەشی ئەو جەستەیە نەخۆشە، ئەی ئەگەر نیوەی کۆمەڵەکەی کە ژنە هەژار و بێ دەرامەت و نیوەکەی تریشی کە پیاوە لە سێ بەش دوو بەشی هەژار بێت چ لەو جەستە کڵۆڵە دەقەومێت، کە دیارە ئەو کارەساتەی لێ دەکەوێتەوە کە ببێت بەخاوەنی لەشێکی داڕزاو و نەخۆش کە ئومێدی لەشساغیی لێ نەکرێت.

وەکو هەمیشەش دەگوترێت ئەقڵی ساغ لە لەشی ساغەوە سەرچاوە دەگرێ، لەم هاوکێشەدا ئەگەر ژن نیوەی هەر نەتەوە و کۆمەڵێک بێت ئەوا بەپێی ئامارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێژەی ژنانی کورد چوار بەپیاوانە، جگە لەوەی ڕێژەی قەیرەیی و بێوەژنی لەناو کوردا هەمان ڕاستی دەسەلمێنێت، بەو پێیە ئەگەر ئەو بەشەی کورد کە پێک هاتووە لە پیاو هەمووشیان ئاستی ئابوورییان لە لووتکەدا بێت، ناتوانێت ئەو تەرازووە لاسەنگەی کۆمەڵی کوردی ڕاست بکاتەوە و تەنانەت ئەو ئامارەش بەهەڵە بژمێرین و نەڵێ سێ بەش ئەوا لە باشترین حاڵدا دوو بەشی کۆمەڵی کوردی کە ژنە لە لووتکەی هەژاریدا دەژین بەوانەشەوە کە خاوەنی مووچە و باخەڵی خۆیانن دیسان گیرۆدەی دەردی هەژارین، چونکە لە ئاستی مووچەی فەرمانبەری کە خواستی هیچ مرۆڤێک ناهێنێتە دی جگە لە هەندێ پێداویستی زۆر سەرەکی لە کاتێکدا زۆربەی ژنان بەو بڕە پارە کەمە ئەرکی بژێویی ژیان و خێزانی کەوتووەتە سەر شان، هیچ قازانجێک لەو پارەیە ناکات بۆ خواستە تایبەتییەکانی خۆی یاخۆ قازانجێکی زۆر ڕێژەیی و کەمی لێ دەکات، چونکە ئەرک و نەبوونیی لەبارتر هەیە لە خواستی خۆی. ئەگەر سەبووریی خەڵکیش بەوە بدرێتەوە کە مووچە هەندێک زیاد کراوە، ئەوە هیچ کات دادی خەڵکی کورد و ژنی کوردی نەداوە، چونکە لەگەڵیدا نرخی شمەک بەتایبەت کرێی خانوو بووە بەئاگر و دەستی هەژارانی کوردستانی پێدا چزاوە، کە ئەڵێم خانوو ئاشکرایە زۆربەی خێزانە بێوەژن و هەژارەکانی کوردستان کرێچین و هیچ کاتێک لە کاتی گۆڕینی دراو و بەرزبوونەوە و پێچەوانەکەی هیچ حسابێک بۆ خەڵکی هەژاری کورد نەکراوە، بەپێی خواست و بەرژەوەندیی سیاسیی کۆمپانیا و کارە بێگانەکان هێنراوەتە ناو شارەکانەوە و لەناو جەرگەی شاردا ئاوایی و خانووە گەورەکان بەپارەیەکی خەیاڵی دەگرن و ئیتر ئەو

مامەڵە و سەودای ئەوان دەبێت بەژیانی خەڵکی کوردستان و سیستەمی بەکرێدان، بەبێ ئەوەی ئەو دەسەڵاتە و حکوومەتە هیچ حسابێک بۆ ڕادەی هەژاری و خەڵکی هەژار لە کوردستاندا بکات.

لەڕووی بازرگانی ئازادیشەوە تەنیا نەتەوەیەک کە ژنی بازرگانی نییە و تا ئێستا ژنێکی تێدا نییە بەمۆڵەت پارەی زۆر مامەڵە بکات و قازانج بکات کوردە، ژنی کورد لەم ڕووە پەرداخەکەی بەتەواوی بەتاڵە نەک نیوە بەتاڵ، سەیر لەوەدایە تەنیا نەتەوەیەکە شەرم دەکات هەوڵی نیوەکردنی بدات نەک پڕکردنی. تەنانەت وڵاتێکی وەکو سعودیەی عەرەبی کە هەتا ئێستا شۆفێری بۆ ژن قەدەغەیە، بەڵام ژووری بازرگانیی ژنانیان و ڕێژەی ژنانی بازرگانیان لە هی وڵاتانی تر گەورەتر و زیاترە، هەر ئەو ژنانەش هاوکاریی مادی چەندین ماڵپەڕی ژنانە و سەنتەری ژنانە دەدەن لە کاتێکدا حکوومەتەکەیان هاوکاریکردن و هەبوونیان ڕەت دەکاتەوە، چونکە باوەڕی بەیەکسانی و بەرابەری و مافی ئافرەتان نییە، بەڵام حکوومەتێک ناتوانێت دژی پڕۆژەیەک بوەستێ کە کۆمەڵی بازرگان و خەڵکی خاوەن پارەی لەپشت بێت. کەچی لەناو کوردا ئەو بەکارێکی نەشیاو دوور لە داوونەریت دەژمێردرێت، ڕاستە لەناو کوردا هەژار بەهەژاری و هەژارتر دەمێنێتەوە، تەنانەت ژنانی پیاوانی خاوەن پارە و ژنانی ئەو لێپرسراوانەش کە پیاوەکانیان بەناوی کەسوکار و خەڵکی نادیارەوە زۆربەی پڕۆژەکانی کوردستانیان قۆرخ کردووەتەوە بۆ خۆیان تائێستاش ژنی کەسیان لە یەکێک لەو پڕۆژانە نزیک نەبووەتەوە وەکو ژنێکی وریا و زیرەک بێتە پێشەوە ببێت بەبازرگان، یان ژنی خاوەنکاری سەربەخۆی گەورە (بزنس ومەن)، لایەنی کەم ئەوانی خێزانی پارەداران ببن بەهاندەرێک بۆ ژنانی دیش کە بێ سڵکردن بێنە بواری کاری ئازاد لە دەرەوەی مووچە ڕەمزییەکەی حکوومەت، لە هەموو جیهاندا نیوەی دوکان و سۆپەرمارکێت و بازاڕەکان ژنان دەیبەن بەڕێوە، هەتا ئێستاش کاری ناو بازاڕ بۆ ژنی کورد عەیب و بڤە و قەدەغەیە، (لێرەوە ناهقیشیان ناگرم



چونکە ئەو حکوومەتە بەناو سیڤیلی یاسایەک و بەڕێوەبردنێکی ئاسایشی متمانەپێکراوی وای بۆ شارەکان نییە کە هەر گەیشت بەتاریکی ژنانی دوکاندار بەدەردی منداڵە بێ سەرپەرشتیارەکانی سەر شەقامەکانی کوردستان نەبەن، یان شمەکەکانیان تاڵان نەکەن)، تەنانەت ژنان بەعەیبی دەزانن باسی مادە بکەن و باسی کاری ئازاد بکەن و گوایە پێیان دەڵێن خەڵکانی مادی و ئەوەش شەرمەزاری بۆ ئەوی ژن، ئەو وشەیە تەنیا بۆ پیاوە، لە کاتێکدا پێچەوانەکەی ڕاستە، شەرمەزاری ڕاستەقینە ئەوەیە کە ژن هەمیشە چاوەڕوانی فریادڕەسێک بێت بۆ ئەوەی لە کێشەکان ڕزگاری بکات و خەونی سەرمایەدارێکیش بکات بەئامانج بۆ ئەوەی بیگەیێنێت بەخەونەکانی، ئەو جۆرە پرۆسەیەش هەندێ جار ڕێگەی نامەشرووع یان نادروست دەگرێتەخۆ کە عەیبەکەی زۆر لەوە زیاتر کە ئەو پێی شەرمە بیکات و بچێتە نێو بازاڕی ئازاد و کارکردن و بەڕێوەبردنی فرۆشگا و ئۆفیسی بازرگانی و... تاد.

بەڵام لەو هەستکردنەشدا دیسان تاوانی ژن نییە و تاوانی ئەو کۆمەڵەیە کە هەمیشە ئەوی وەکو سمبولی چاو لە دەستی پیاو وێنە کێشاوە، تاوانی ئەو ڕێکخراوانەیە کە هۆشیارییان نەگەیشتووە بەئاستێک ڕەچەشکێن بن و ئەوانیش لە بەزمی پارە خواردن بێنە دەرەوە بۆ دروستکردنی، یان پارە دروستکردن و هاندەری ژنان بن و خولی هۆشیارکردنەوەی ئەو لایەنانەیان هەبێت، تاوانی ئەو حکوومەتەیە کە تائێستا بۆ بەڕێوەبردنی لایەنە ئابوورییەکان بەهیچ شێوەیەک ژنی نزیک نەکردووەتەوە و بەکەمی زانیوە بۆ ئەو بوارە، ئەو دەردی ژن دوورگرتنەش لە مەسەلەی بەڕێوەبردنی ئابووریدا تەنیا دەسەڵاتی کوردیی پێ عەیبدار نەبووە، بگرە ڕێژەی کارکردنی ژنان لە پۆستە ئابوورییەکان لە جیهاندا بەم شێوەیە، هەتا ئێستا ڕێژەی ١٪ی سەرمایەگوزەرانی جیهان بەناوی ژنەوەیە ژن خاوەنداری دەکات، لە کاتێکدا توانای پیاوانی تەنیا وڵاتانی عەرەبی بۆ کڕین ٣,٥٪، بەپێی ئاماری نەتەوەیەکگرتووەکان ٧٠٪ی ئەو کەسانەی لە

هەژارێکی کوشندەدا دەژین ژنن و بەرادەیەک ڕۆژانەیەکی لە یەک دۆلار کەمتر دەژین، لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکادا زیاتر لە ٣,١ ٪ی ئەو خێزانانەی ژن بەڕێوەی دەبەن لە هەژاریی کوشندەدا دەژین.

هەتا ئێستا ژنان هەبوونیان لە کاری بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی ئابووریدا تەواو کەمە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەکو فەرەنسادا ٩ ٪ی ئەو جێگە باڵایانەیان گرتووە، لە هۆڵەنداش ٢٠ ٪ی ژنان سەنتەرەکانی جێبەجێکردن و بڕیاردانی خراوەتە دەست.

لە سەرجەم وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا تەنیا ڕێژەی ٣٣ ٪ی ژن پۆستی بەڕێوەبردنی بەرزی ئابوورییان گرتووە.

بەگشتی ڕێژەی ژن لەو پۆستانەدا لە وڵاتە پێشکەوتووەکان ٣٣ ٪ لە ئەفریقیا ١٥ ٪ و لە ئاسیا و پاسیفیکیش ١٣ ٪ لە کۆی ٥٠٠ کۆمپانیای زلهێزیش لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا تەنیا ٥ ژن کاری جێبەجێ کردن و بەڕێوەبردنی پێ سپێردراوە ئەوانیش ئەمانەن: سفیرون، باکارد، هویلت، جولدن ویست فایننشاڵ و ئافۆن برۆدکتس، کسیرۆکس.

لە سیلیکۆن فالیش ١٠٠ پشک پیاو خاوەندارێتی بەرامبەر یەک پشکی ژنان. ئەو کەم نرخاندن و نەخەمڵاندنەشە ئەمرۆ ژنانی بەرەو کەنارەکانی جۆرەها کاری نەشیاو بردووە. مەترسییەکانی ئەو هەژارییەش ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایە.

ئەوەی ئەمرۆ پێویستە بێتە ئاراوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو تەنگژە ئابوورییانە هەندێک بەرەو سڕینەوە بەرێت، هەبوونی بزووتنەوەیەکی فیمینستییە کە پرۆژەی جیاوازی بۆ بەرەو پێشبردنی بژێوی ژیان و فیکری ئابووریی ژنان هەبێت، ئەویش بە کردنەوەی سەنتەری بازرگانی و کردنەوەی کۆلێج بزنس یاخۆ خولی فێربوونی کاری بازرگانی و ڕۆشنبیریی بازرگانی بەشێوەی پراکتیکی. کە دیارە لەمانەدا مەبەستم پەیمانگا و زانکۆکان نییە کە ساڵانێک خەڵکێک دەچێت دەخوێنێت و سوودێکی



ئەوتۆی بازرگانیشی نییە، مەبەستم ئەو خولە خێرایانەیە لە هەموو وڵاتاندا هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا کۆرسی چەند مانگی هەیە سەرجەم بزنسکارەکان وەری دەگرن و لە کاتێکی زۆر کەمدا کە تەنیا بۆ ماوەی سێ مانگ سوودی چوار ساڵی زانکۆی لێ وەردەگرن.

* پێداگرتن و داواکردن لە حکوومەت بۆ دابینکردنی مووچە بۆ هەموو بێوەژنێک هەرچییەک بێت هۆی بێوەژنییەکەی.

* بەهاوکاریی حکوومەت (نەک حزب) لەگەڵ ڕێکخراوە خێرخوازەکانی جیهاندا بۆ کردنەوەی کۆمەڵێک شوقە بۆ بەکرێدانی بەنرخێکی ڕەمزی بەو ژنانەی کە پاشماوەی ئەنفال، هەڵەبجە و کارەساتەکانی تر کورد و بێوەژنەکان و ئەو ژنانەی لێپرسراوێتیی خێزانیان لە ئەستۆدایە و هەژارن.

* ئەو پارە ڕەمزییەی کە وەردەگرێت بکرێت بەپرۆژەی بازرگانی بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوەیە ببێت بەخاوەن ئابوورییەکی سەربەخۆ.

* هەبوونی پرۆژەی هۆشیارکردنەوەی ژن بۆ خوێندنەوە، پەروەردە و منداڵ و بایەخدان بەخۆی کاتی سکپڕی.

* هەبوونی پرۆژەی پرۆگرامی ئەدەب و ڕۆشنبیریی منداڵان.

* دابینکردنی سەرجەم دەرمان و کەرەستەکانی منداڵ نەبوونی کۆنترۆڵکردنی منداڵبوون و لەباربردن بەخۆڕایی، لە میانەی بنکەیەکی تایبەت بەنەخۆشییەکانی ژناندا.

* لە میانەی ئەو سەنتەرە گەورەیەدا کردنەوەی بەشی کۆمەڵایەتی و دەروونی بۆ تەمەنە جیاوازەکان و دابینکردنی کەسانی پسپۆڕ بۆ کەسانی ئالودەبووی دەردە دەروونییە کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنیان، بۆ نموونە کاتێک کچێکی هەرزەکار پرۆسەی سێکسی ناسروشتی (وەکو کەسێک ئێجگار منداڵ، یان نزیک لەخۆی، یان گەورەتر، یان کچێکی تر و... تاد) ئەنجام دەدات ئەو کچە بەر لە دادگا و بەر لەوەی بخرێتە بەر ساتۆری کۆمەڵی بێ ڕەحم و خێزان پێویستە ببرێتە سەنتەری کۆمەڵایەتی و

دەروونییە پسپۆڕەکان، چونکە هیچ دیاردەیەکی ناسروشتی لە مرۆڤی سروشتی ناوەشێتەوە بەر لە ئالۆدەبوونی بەیەکێک لەو دەردانە، ئەمە بۆ تەمەنەکانی تریش هەر وایە. بەڵام کە بەشێوەیەکی تر مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕووداوانەدا کراوە لەبەرئەوەیە لایەنێک پاڵپشتێک دڵسۆزێک نەبووە بۆ ژنان کە بەشێوەیەکی زانستی لە کێشەکانی بکۆڵێتەوە.

* کردنەوەی بەشی داد لەو سەنتەرەدا بۆ بەرگریکردن لە کێشەکانی ژنان لەناو دادگادا.

* هەبوونی کۆرسی خوێندن بۆ سەرجەم پیشە و زانستە جیاوازەکان.

* هەبوونی فێرکردنی خوێندەواری و کارەکانی دەست بۆ ژنانێکی ئاست نەوی لە ڕۆشنبیری و خوێندەواریدا.

* دامەزراندنی تەلەفزیۆنێکی تایبەت بەژنان، کە سەرجەم کارەکانی لە خزمەت ژن و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵ بێت بەرامبەر ژن و منداڵ.

* هەبوونی شوێنگەی حەسانەوە بۆ ئەو ژنانەی شار بەشار دەکەن لەپێناوی خزمەتکردن بە ژنان و هاوکاریکردنی مادییان و بۆ هاتوچۆ، لە هەمان کاتدا هەبوونی شوێنی حەسانەوەی شەو.

* هەبوونی شوێنگە بۆ ئەو ژنانەی بەتۆمەتی کۆمەڵایەتی ژیانیان دەکەوێتە مەترسییەوە.

* هەبوونی تیمێک بۆ بەدواداچوونی ئەو تاوانانەی بەرامبەر بە ژن دەکرێن و بەمەسەلەی ناموس پەرستی پەردەپۆش دەکرێت.

ئەمڕۆ ژنانی کورد هێندەی پێویستی بەپرۆژەیەکی جدی لەو جۆرە هەیە پێویستی بەجۆرە پرۆژەکانی تر نییە کە تەنیا بۆ بانگەشە دەکرێن، هێندەی پێویستی بەپرۆژە کۆمەڵایەتییەکان هەیە کە لە ڕیشەوە لێی بکۆڵرێتەوە هێندە پێویستی بەپرۆژەی مۆدێرن نییە، چونکە ژنێکی نامۆدێرن ناچێتە پرۆژە مۆدێرنەکانەوە، ژنێکی ئالوودە بەهەژاری و ڕاکردن بەدوای ناندا ناچێت بۆ مەلە و قاوەخواردنەوە لە دەرەوە، لەوانەیە بگوترێت هیچ



لایەنێک هاوکاری پرۆژەی لەو جۆرە ناکەن، دەڵێم ئێوەی ژن سەرەتا بزووتنەوەیەکی فیمینستی ڕێک بخەن و داوای وەکو حزبێکی فیمینستی خۆتان ڕابگەیەنن کە هەموو ئەندامەکانتان ژن بێت و سەرجەم کارەکانیشتان بخەنە چوارچێوەی ئەو ئامانجانە کە باسکراون، ئەو کات کام دەسەڵات هێندەی یەکێک لەو حزبە تیرۆریستانە لە کوردستاندا دەکرانەوە و بەناوی فرە حزبییەوە مانگانە دوو ملیۆن دیناریان وەردەگرت ناداتێ، گەر ژنان ئەو کۆبوونەوە و یەک دەنگییەیان هەبێت و خۆیان بەو عەقڵییەتە لە چوارچێوەی ڕێکخراو بێت یان حزب یان هەر بیانوویەکی تر کە بتوانن ژنی کورد لە نەهامەتییەوە بگوێزنەوە بۆ ژیانێکی باشتر هەر دەکرێت هێندەی حزبە تیرۆریستەکان هاوکارییان بکرێت! لەوانەیە بگوترێت هەندێک لەو بنکانە لە کوردستاندا هەیە، بەڵێ بەبانگەشە هەیە بۆ ئەوەی بگوترێت فلان سەنتەر و فلان ڕێکخراو خزمەت دەکەن بەڵام ئایە بەڕاستی خزمەتیان کردووە و توانیویانە بگەن بەئاستی پێویست و خواستی ژنان و کۆمەڵێکی مەدەنی. جگە لەوەش بەدڵنیاییەوە هەتا کاری ژنان لە دەستی گرووپ و ژنانی حزب و حزب دەرنەهێنرێت بۆ دەستی کەسانێکی زانستخواز و خاوەن ئیرادە و خاوەن جیهانبینی و گوتاری ژنانە کە من ئەوە لە فیمینزمدا دەبینمەوە هەرگیز کێشەی ژنی کورد بەرەو پێشەوە ناڕوات و ناتوانین بگەین بەچارەسەری بابەتی بۆ کێشەکانی جگە لە مەترسی دووبارەکردنەوەی ئەو نەهامەتییانەی لە ڕۆژئاوادا ڕوو دەدەن، کێشەی ژنی کورد هێندەی ئەمڕۆ کێشەیەکی ڕۆشنبیری، فەلسەفی، فیکرییە هێندە پێوەندیی بەسێکوچکەکانی دیییەوە نییە، چونکە کێشەی ژنی کورد ئەمڕۆ لەلایەن کۆمەڵێکەوە دەبرێت بەڕێوە کە خۆیان کێشەی فیکریان هەیە لە تێگەیشتن لە کێشەی ژنان، خۆیان کێشەی فەلسەفییان هەیە لە تێگەیشتن لە چمکەکان، خۆیان کێشەی ڕۆشنبیرییان هەیە لەخۆ پاککردنەوە لە گوناهەکان بەرامبەر بەژن، خۆیان خاوەنی گوتاری ژنانە نین، کەواتە کێشەی ژنی کورد تەنیا بەیەک پێوەر دەچێتە پێشەوە ئەویش لە

ڕەگەوە دامەزراندنی دەزگایەکی تەواو جیاوازی تایبەت بە ژن، فیکرێکی تەواو لەوە جیاواز هەیە، کە ئەوەش متمانە دەخاتە سەر ئابوورییەکی پەرەسەندوو بەڵام لە ڕاستیدا کورد چەندیش هەژار بێت هێندەی پارە لە پڕۆژەکانی بەناو ژنانەوە بەهەدەر دەدرێت، ئەگەر دڵسۆزانێکی دوور لەو گوناهانەی کە باس کراون، ئەگەر بزووتنەوەیەکی فیمینزمی دروست ببێت دەتوانێت هەموو ئەو ئامانجانە بهێنێتە دی کە باس کراون بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی فریادڕەس و ئەسپەکەی تەروادە بکات بیباتە بۆ خەونە خۆشەکان.

## ئامانجی سیاسیی فیمینست

مرۆڤی فیمینست ئامانجی ڕێکخستنی ژیانە بەباشترین شێوە چونکە تەنیا وشەی ڕێکخستن واتای ئەوەی نییە ئێمە خاوەنی کۆمەڵێکی ڕێکخراوین بەهەبوونی ڕێکخراوێکی زۆریش واتای ئەوە نییە ژنان ڕێکخراون و ڕێکخراوەکان لە لایەنی ژنان و گوتاری ژنانەوە مۆنۆپۆڵە کرا بێت.

بۆیە ئایدیای فیمینستی هەوڵ دەدات بۆ دەستەبەرکردنی گوتارێکی ژنانە کە لە میانەی جیهانبینی و مەعریفیی ژنەوە گەڵاڵە بووبێت، لەپێناوی یەکدەنگی بۆ یەکگرتنی ژن کار بکات و بزانێت دەسەڵات و سیاسەت ئاوازی لەناوبردن نییە، بگرە ئاوازی بنیاتنان و ڕێکخستن و ئاسانکاریی ژیان و بەرجەستەکردنی تەبایی و ئاسایش و ئاشتی و مەعریفەیە بۆ مرۆڤ، چونکە ژنی فیمینست دەزانێت بەرلەوەی باس لە دەسەڵاتی ژن بکات، دەسەڵاتی خۆشی و ژنیش پابەندی ئاستی کۆمەڵایەتی و هەلومەرجی گۆڕینەیەتی کە ئەمەش دیسان پابەندی ڕێسا ئابووری و ڕۆشنبیری و هۆشیارییەکان دەبێت.



## شەرعیەتی فیمینستی سیاسی

هەر سیستەمێک لە سیستەمەکانی سیاسەت بەو جۆرەی کە هەیە سیاسەتی خۆی دادەڕێژێت و شەرعیەت دەدات بەخۆی، هەندێ وەکو بۆماوەیی خەڵاتی دەسەڵاتیان دەست دەکەوێت، ئەوەش لە دەرەوەی خێزانەکەیان بێتە ناو دەسەڵات و بەنامشروع دێتە ژماردن، هەشە بانگەشەی دیموکراسی و لیبرالی و سەرجەم چمکە قورسەکانی جیهانی خۆرئاوا دەکات، بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەهەمان شێوە و خراپتریش دەسەڵات قۆرخ دەکەنەوە لە دەستی خەڵکانی بنەماڵەدار و دەوروبەری خۆیان گەرچی بەناوی نیشتمانی و گشتگیریشەوە کار بکەن ئەوا دیسان دەسەڵات بۆ ئەو کەسانەیە کە پەرە بەڕێباز و بیروباوەڕەکەی دەدەن نەک بۆ بەرژەوەندیی خۆیان کار دەکەن نەک کەسانێک بۆ بەرژەوەندیی گشتی کار دەکەن. لە ڕۆژهەڵاتدا و بەتایبەت لە ناو کورددا من باوەڕ بەو هەڵبژاردنانەش ناکەم کە بەحیساب بەشێوەیەکی دیموکراسی دەچێت بەڕێوە، چونکە هیچ کام لە هەڵبژاردنەکان دوور نییە لە دەستی تەزویر و فێڵکردن لە جەماوەر.

بۆیە پێویستە بزووتنەوەی فیمینستی خۆی بەخەونی دەسەڵاتەوە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتانەی ئەمڕۆ لە مەیداندان خۆی خەریک نەکات، چونکە وەکو لە تەوەرەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە ئەو دەسەڵاتانە ڕێگەی خەونبینینی بەمرۆڤ نادەن لە دەرەوەی خەونەکانی خۆیان بگرە پێویستە لە ڕێگەی بالاکردنی ئایدی فیمینزم لەناو کۆمەڵدا بیروباوەڕی ببێت بەدەسەڵاتێکی گەورە، هەر بیروباوەڕێکیش توانی بیر و قەناعەتی خەڵکێک زۆر داگیر بکات، توانی جیهانی کوردی لە خورافەی فریادڕەس و ڕەمز و دروستکردنی وەهمییەوە دەربهێنێت بۆ جیهانی واقیع بەرفراوانترین دەسەڵاتی بەخۆی بەخشیوە و پەسەندترین سیاسەتی کردووە، چونکە جیهانی کورد لە خەونی هاتنی فریادڕەسێک بۆ ڕزگاربوون. بۆ گەیشتن بەسەنتەر بۆ سارێژکردنی برینەکان؛ بۆ بەرهەمهێنانی خەونەکانی ڕزگاری

نابێت. ژنی کوردیش بەهەمان شێوەی خەونی فریادڕەس بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی درێژەی بەخەونی ئەو فریادڕەسە داوە لە هەرزەکاریدا دێتە خەوی بەسەر پشتی ئەسپێکی سپییەوە دەیباتە کەنارەکانی ئاوابوون و ژوانی عیشقی لەگەڵدا دەبەستێت. ئەرکی فیمینزم ئەوەیە مرۆڤ لە خەون دەربهێنێت بۆ واقیع، لە واقیعیشدا زانستییانە لە خەونە نەهاتووە دیبیەکان بکۆڵێتەوە. چونکە فیمینزم جیاوازیی نێوان بەها و سیاسەت ناکات. بۆیە لە سیاسەت و ئایدیۆلۆجیای بێ بەها نزیک نابێتەوە.

فیمینزم ئەو ئایدیۆلۆجیایە، فیمینست ئەو مرۆڤەیە کە هەوڵ دەدات بەها مۆراڵییەکان لە میانەی ئەوەی لە واقیع و لە بنیاتی کۆمەڵدا هەیە بەرجەستە بکات، ئەو کۆمەڵەش کەسێک هەڵدەبژێرێت هاوکاریی بەڕێوەبردنی بکات، ئەو مرۆڤەش پێویستە سیفەتەکانی مۆراڵی عەقڵی، کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و مرۆیی و لەخۆبووردییی تێدا بێت. کۆمەڵ ڕازی بێت بەو پۆستەی کە وەری دەگرێت ئیتر بەرچاو نەکردنی ئەوەی ئەو کۆمەڵە بچووکە یان گەورە.

مەسەلەی ژن بانگەشە نییە هەندەی پابەندی مەعریفە، مۆراڵ، فەلسەفە و ڕەنگدانەوەی تیۆرییە گشتگیرییەکانن بۆ کۆمەڵ، قەناعەتی قووڵی مرۆڤە کە بەبێ پراکتیزە بێ ناوەڕۆک و پێناس دەمێنێتەوە.

کاتێک باس لە مانشێتی باسەکان دەکرێت، بەتایبەت ئەوانەی پابەندی مەسەلەی ئازادیی ژنان و یەکسانییانن لەگەڵ ژناندا لەڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و گەشەسەندنەوە... هتد، هەر زانیارییەک پێوەندیی بەژێندەرەوە هەبێت داوامان لێ دەکات بگەڕێینەوە بۆ بنەماکان، لەو نێوەدا دەتوانین یەکەی کار و جوداوازی و هەڵوێستەکان و پرۆسەیەکی زانستی بدۆزینەوە.

لێرەوە ئەگەر ئەوانەی خۆیان بەمەسەلەی ژنان خەریک کردووە، یاخۆ خۆیان بەبەرگریکاری ژن دەزانن ئەگەر لەو ڕوانگەیە پەلاماری مەسەلەی



ژنان بدەن، ئەوکات تەنانەت ئەگەر بەکگراوندێکی عەلمانی یان ئاینی و زانستی و پارێزگاریشی هەبێت دواجار دەگەن بەهەندێ بیروڕای گشتگیر و یەکدەنگی یاخۆ یە ئامانجی کار لە زۆر ڕووەوە، کە دەکرێ لە هەندێ باوەڕی تردا جیاوازییان هەبێت یاخۆ جیاوازییان لە ئالیەتی جێبەجێکردندا هەبێت. ئەمەیە ئەو باوەڕەیە کە ژنی فیمینست لەخۆی دەگرێت و کورد لێی بێ بەشە، تەنانەت هەندێ وڵاتی دواکەوتووی عەرەبی کە هیچ ئاگایان لە فیکری فیمینزم نییە گەیشتوون بەو ئاستە لە ئامانج و کارکردندا، بۆ نموونە وڵاتێکی وەکو مەغریبی عەرەبی کە تەنیا چەند ساڵێکە مافی خۆ هەڵبژاردنیان بە ژن بەخشیوە بۆ پەرلەمان. (منتدی الزهرا) کە (سمیه بن خلدون) سەرپەرشتی دەکات ٣٠ ڕێکخراوی عەلمانی و ئاینی و لیبرال و سەرجەم بیروڕاکانی تری لەخۆی گرتووە، سەرجەمیان بەیەک دەنگ بۆ وەدیهێنانی مافەکانی ژنی مەغریبی کار دەکەن ئەگەر لە هەندێ بیروباوەڕیشدا جیاواز بن.

ئەمە ئەو دەردەیە کە ژنان لە جیهاندا ئاڵوودەی بوونە، دەردی جیاوازی و یەک نەگرتن، تەنانەت ژنانی ڕۆژئاوا ئەمڕۆ تووشی بێ ئومێدی بوون لەبەرئەوەی نەیانتوانیوە تائێستا خاوەنی ئەو یەکدەنگی و یەکدەستییە بن کە خواستی ئەوانە. بەخوێندنی ئامانجەکانیان هەر یەک لەسەر ئاوازێک، کێشەکانیان ئەوەندە ئاڵۆز بووە کە زانایانیشیان زۆرجار سەری لەبەر دەرناکەن و هەندێکیان پێیان وایە پێویستە ژنی ئەوروپی جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵ و بەخێوکردنی منداڵ بۆ ئەوەی ڕێسا و پنتی نوێ بۆ ئەو مەسەلە دابڕێژن و لە میانەی ئەو پنت و میکانیزمەوە بتوانێت مافەکانی کۆنترۆڵ بکات.

هەر ئەو بێ سەروبەرییەی ڕێکخراوەکانی ڕۆژئاوا وەکو ئێستا لای ئێمەش باوە وای لە ژنە نووسەری بەریتانی (دووریس لیسەنگ) کە ساڵی ١٩١٩ لە زیمبابوی ئێستا لە دایک بووە یەکێک بوو لە بەرگریکارە سەرسەختەکانی ژنان و ڕووخێنەری بیری کۆنەپارێزی و دامەزرێنەری

سەندیکای (Net Cr Dor) کە بۆ هەمان مەبەست دای مەزراندووە، یەکێکە لە پاڵەوانەکانی دژەکاری زوڵم و زۆرداری داگیرکردن و ڕەگەزپەرستی، ئەمڕۆ لیسەنگ کە لە تەمەنی **٨٥** ساڵیدا دەژی بەهیچ شێوەیەک ڕای خۆی دەربارەی مەسەلەی ژنان دەرنابڕێت بەهۆی ئەو بێ ئومێدییەی ڕێکخراوەکانی ژنان تووشیان کردووە.

بۆیە کاتێک دەڵێم فیمینزم مەبەست ڕێکخستنی هەموو دەنگ و ڕەنگەکانی ژنە هونەرێکی پەسەندە وەکو پرۆژەیەکی زانستی، مرۆیی، مەعریفی و دیموکراسی ببینین.

## سەرچاوەکان


Feminis family values plainview pr. 1996... Gloria Steinem.

1- Feminist Theory... Josephine Donovan.

٢- جمهورية افلاطون... ترجمة محمد حسن.

٣- هەمان سەرچاوە.

٤- (ئەم مەسەلەیەم لە کتێبی ژنی کورد لە دەروازەی هەزارەی سێیەمدا بەدرێژی باسم لێوە کردووە).

٥- ژنی کورد لە دەروازەی هەزارەی سێیەمدا... کازیوە ساڵح.

٦- تقرير مركز الاقليمي للأمن الانساني في معهد الانساني في معهد الدبلوماسي الاردني.

٧- العقلانية... Rationalism

8- Feminist Theory... Josephine Donovan.

9- www.encyclopedia.com

10- Susan B.

Anthony http: //www.susanbanthonyhouse.org/biography.html...

11- Pankhurs, Emmeline Goulden... http: //www.encyclopedia.com/html/P/Pankurs





12- www.nyu.edu

13- EMINA GOLDMAN... http: //sunsite.berkeley.edu/Goldman

14- Janet RANKEN... http: //www.johngriley.co

15- Sherley Chisholm... http: //www.usroots.com

16- Gloria Steinem... http:// www.nwhp.org

١٧- هزری مێینەی کورد لەنێوان بەرهەمهێنانی خەون و ئەگەری بڕیارداندا... کازیوە ساڵح. نقار. ژمارە ٢

١٨- لەوانەیە هەندێک و بزانیت ئەو جۆرە ژنە لەناو کۆمەڵی ئێمەدا نییە و ئەوەی دەیڵێم چەند وشەیەکی خەیاڵییە، بەڵام بەداخەوە ئەوە حەقیقەتە و نموونە و بەڵگەم لە لایە (.........) نامەوێت لە بەهای نووسینەکەم کەم بکەمەوە و لێرەدا بیخەمە ڕوو بەڵام بەدڵنیاییەوە خستنە ڕووشی کاتی خۆی دێت.

19- Politologie... http: //damoo.csun.edu

٢٠- تایبەتی خۆی کە بەبانکی سپێرم ناوزەت دەکرێت و لە ڕۆژئاوادا ژمارەیان زۆرە کە خەڵکانێک دەچن سپێرمی خۆیان دەفرۆشن بەو بانکانە و ژنانێکیش کە منداڵیان نابێت دەیکڕن و لە منداڵدانی خۆیاندا دەچێن بۆ دروستکردنی منداڵ).

21- Margaret Sanger... http: //www.nyu.edu

## بەشی چوارەم

- خۆشەویستی یان ئازادی سێکسی و ئایدیای فیمینزمی؟
- چمکی خۆشەویستی
- ئایا خۆشەویستی نموونەیی یان خاوێنبوونەوە یان تیۆر؟
- دژ و تەبایی خۆشەویستی و سێکس
- لەشفرۆشی، ئازادی سێکسی یان خیانەتی هاوسەری
- ئایا فیمینزم باوەڕی بەئازادی سێکسی هەیە؟
- لە کار کەوتنی عەقڵی بەکارنەهێنراو
- مرۆڤ، خود، سەنترالیزمی بوون

## خۆشەویستی یان ئازادی سێکسی و ئایدیای فیمینزمی؟

ئەگەر خۆشەویستی ون بوو، ئەوا هەموو
ئەو شتانەی ون دەبن کە پێویستە هەبن
شکسپیر

مامۆستاکەم لە درێژەی پرسیارەکانیدا کە لە هەموومانی دەپرسی، نۆبە هاتە سەر ئەو هاوڕێیە پۆلەم کە تەنیا چەند مانگێک بوو وڵاتی جوبە و عەمامەی بەجێ هێشتبوو، پرچەکانیشی تەنیا ئەو چەند مانگە هەوای دەرەوەی حیجاب و جوبەی هەڵمژیبوو، دەپرسێت:

– تۆ پێوەندی خۆشەویستیت لەگەڵ هیچ کوڕێکدا هەیە لەوەتەی هاتوویتە ئێرە؟

ئەویش وەڵامی مامۆستاکەمان دەداتەوە:

– نەخێر من هیچ کەسێکم خۆش ناوێت.

– مامۆستا: بەڵام تۆ دوێنێ گوتت من لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکەم Boy Friendدا دەژیم!، کە وابزانم ئەمە جورئەتێکی باشە بۆ خەڵکانی لای ئێوە، چونکە قوتابییەکانی تر بۆیان باس کردووم کە ژن لای ئێوە ئەو مافەی نییە؟

– قوتابی: بەڵێ وایە من لەگەڵ هاوڕێ کوڕەکەم دەژیم، بەڵام خۆشم ناوێت و نامەوێت پیاوم خۆش بوێت چونکە فیمینستم.

بەخۆم نەبوو کە زۆر بەتووڕەیی لێی هاتمە وەڵام کە فیمینست لەو ونبوونەی ئەو بێ بەرییە و ئەو تاوانە چۆن دەداتە پاڵ فیمینست. مامۆستاکەمان گوتی تۆ یارمەتیم بدە من پێم خۆشە لێی بپرسم کە ئەو نایەوێت پیاوی خۆش بوێت لە ژێر ناوی هەر بیانوویەکدا بێت، ئەی بەچ بیانوویەک لەگەڵ ئەو کوڕەدا دەژی؟



زۆر بەمتمانەبوون بەخۆ و بەدەنگێکی نێرانە گوتی: لەگەڵیدا دەژیم بەبەرژەوەندیی فیزیکی خۆم، لەشم پێویستی پێیەتی.

منیش لێم پرسی:

– باشە پێوەندیی لەشی بەپێوەندیی ڕۆحی پێوەندێکیی ئاژەڵییانە نییە، ئەی لای کوڕەکە خۆشیدا بەم شێوە قسە دەکەین یان دەڵێیت خۆشم دەوێیت؟!

– بەڵێ دەڵێم خۆشم دەوێت بۆ بەرژەوەندیی خۆم.

لێرەدا هەریەک واز لە گفتوگۆکردنەکە دەهێنین چونکە دەزانین بەرەو قێزەونی دەچێت و هێڵی سوور دەبڕێت بەرەو ناشیرینکردنی هەستە جوانەکان و ڕاستگۆیی.

ئەو وتوێژە کورتەی سەرەوە و بانگەشەی هەندێ خانمی کورد کە بەو دواییە لە وادەی زەماوەندکردنی نوێمان لەگەڵ عێراقدا پەیدابوون و لە ڕۆژنامەکانەوە ناوی خۆیان دەڵێن و دان بەوە دادەنێن لەشفرۆشتن گوایە جەسوورییە، پاڵنەر بوون بۆ نووسینی ئەم بابەتە، تێگەیشتن لە خۆشەویستی لای فیمینزم و مرۆڤی فیمینستی وەکو ئەوەی کە هەیە، نەک وەکو ئەوەی خواستی ناچیزەی مرۆڤەکان چوارچێوەی بۆ دادەڕێژێت و بەهانەیەکی بۆ دەدۆزنەوە کە ئەو خواستە نەشیاوەیان لەخۆ بگرێت، ژنی ڕۆژهەڵاتیش چونکە خاوەنی بیر و خوێندەواری و ئەندێشەی دژوارە و لە فیکری فیمینزمی و مرۆڤی فیمینست تێ ناگات، لە بنەمادا فیکرەکەش بەمرۆڤی ڕۆژهەڵاتی نامۆیە، بۆیە پەنا دەباتە بەر ئەو چمکە وەکو پاڵپشت بۆ هەڵەکان و ناچیزەکانی ژیانی خۆی بەکاری دەهێنێت.

### چمکی خۆشەویستی:

چمکی خۆشەویستی کە پێکهاتەی گرینگی ژیانی مرۆڤە، هەریەک لە زانایان و پسپۆڕان و دەروونناسان ڕاڤە و لێکۆڵینەوە و شرۆڤەی خۆیان

هەبووە دەربارەی ئەو چمکە و هەمیشەش بەپێی گۆڕانکارییە ئابووری و شارستانییەکان گۆڕانکاری بەسەر زۆرێک لە ڕاڤەکردنەکاندا هاتووە، هەڵبەت بۆ دۆزینەوەی هێڵی سەرەتای هەر چمکێک پێویستە بگەڕێینەوە بۆ شارستانییەتی دەوڵەمەندی یۆنان کە هەمیشە فلّچەی یەکەمی ئەدەبی و فیکری و فەلسەفییان لەو چمکانە داوە، هەر وێنانییەکانیش بوون هێڵی جوان و ناشیرینی خۆشەویستییان دیاری کرد و پۆلّینیان کرد بۆ چەند جۆر لەوانە:

- خۆشەویستیی سۆزداری یان ڕۆمانسی.
- خۆشەویستیی لۆجیکی.
- خۆشەویستیی هاوڕێیەتی.
- خۆشەویستی تاکەکەس.
- خۆشەویستیی پشت بەستوو بەبەرامبەر.

نامەوێت بچمە سەر شیتەڵکردنی جۆری خۆشەویستەکان، هێندەی مەبەستم ماهییەتی خۆشەویستییە لای مرۆڤ، هێندە مەبەستم شارەزایی لە بەشەکانی نییە، چونکە لە بنەمادا هەموو جۆرەکان لام دابەش دەبن بەسەر دوو تەوەردا یان بەسەر تەوەر و دژە تەوەردا، ئەوانیش خێر و شەڕ و ڕاست و درۆیە، بەو واتایە هەندێک خۆشەویستی دەکات لە پێناوی سۆزێکی مرۆڤانە وزەبەخش بەتوانا و جوانکار بۆ ژیان، خۆشەویستی تەنیا لە پێناوی خۆشەویستیدا دەکات، هەندێکی تر خۆشەویستی دەکات لەپێناوی مەبەستێکی دیاریکراودا و نواندنی خۆشەویستیی ناڕاست دەکات بەئامراز لەپێناوی گەیشتن بەئامانج، واتە خۆشەویستی دەکات بەئامراز بۆ گەیشتن بەئامانج، ئەو ئامانجانەش لە کەسی (من ناوی دەنێم فریودراو) بەدی دێت بۆ کەسی فریودەر نەک خاوەن سۆزی مرۆڤانە. بەڵام سەرجەم ڕاڤەکان ناتوانێت ئەوە لە هزری مرۆڤی خاوەن سۆزدا بسڕێتەوە کاتێک بیری بۆ لای تەوەری یەکەمی خۆشەویستی دەفڕێت واتای



قوربانیدان، لێبووردن، چاوپۆشین لە هەڵە و کەموکوڕییەکانی خۆشەویست، چاودێریکردن بۆ پاراستن و هەوڵدان بۆ بەختەوەرکردنی بەرامبەر، ڕازیکردن و هەوڵدان بۆ بالاّکردنی پلەوپایەی خۆشەویست و بەرز ڕاگرتنی مادی و مەعنەوی ئەو خێزانەی خۆشەویست لەخۆ دەگرێت و تەنانەت لە هەندێ باردا دەستبەردان لەو خۆشەویستە لەپێناوی ڕاگرتنی بەرژەوەندیی خۆشەویستدا و... تاد بەهزریدا گوزەر نەکەن. ئەگەر خەیاڵیشی بەلای تەوەری دووەمدا ڕۆیشت دەروونی سەغڵەت نەبێت بەگومانی دووڕوویی، درۆ، بێ وەفایی، غەدرکردن و بێ متمانەیی و سەرجەم گومانە نەشیاوەکانی تر کە بەتەواوی خاڵی دابڕ دەبێ لەنێوان هەردوو لایەندا بەواتای خێر و شەڕ هزری داگیر نەکەن.

ئەگەر لە چمکی خێر و شەڕیش وردبینەوە دەزانین ئەو چمکەیە زۆربەی زانایان تیۆرییەکانی خۆیان لەسەر بنیات ناوە و هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفەشەوە داهێنەری فەلسەفە فەلسەفەی خۆشەویستی دواون، سوکراتی یەکەم داهێنەری فەلسەفە لەو مێزگردە بەناوبانگەدا کە بە(المأدبة) ناسراوە، سەبارەت بەتێڕوانینی سوکراتە بۆ خۆشەویستی پلەکانی خۆشەویستی دەردەخات کە خۆشەویستی لەشی و ڕۆحی و نموونەیی هەیە، وەپێی وابوو خۆشەویستیی نموونەیی ئەقڵی مرۆڤ دەتوانێت تێیدا بالاّ بێت بەسەر جیهانی هەست و ڕۆحدا کە بەستراوە بەخەڵکەوە بۆ جیهانی جوانی ڕەها و نموونە، ئەو خۆشەویستییەش لای ئەفلاّتون بوو بەئامانجی ئامانجەکان، چونکە لای ئەفلاّتون خۆشەویستی لە جوانی هزر و زینەوە گەلاّڵە دەبێت و بالاّ دەبێت بۆ کرداری جوان، شێوەی جوان، بۆ بیروباوەڕی جوان هەتا بیروباوەڕی جوانی ڕەها. ئەمەیە کە پێی دەگوترێ خۆشەویستیی ئەفلاّتون. بەپێوەری فەلسەفی کە سەرجەم پێوەرە مۆراڵی و هزری شیاوی و جوانی دەگرێتەوە تەوەری دووەمی خۆشەویستی کە پێوەندیی نێوان فریودەر و فریودراوە لە پێناسەی خۆشەویستیدا زەمینەی نییە و سەرجەم ئەو چمکە پیرۆزانەی سەرەوە کە لە چمکی

خۆشەویستیدا تواونەتەوە ڕێگە بەهیچ پێناسەیەکی دژ نادات خۆی بخزێنێتە نێو مەودا فراوانەکانی، ئەوەشی پێناسە و چمکێکی تر بداتە پاڵ جگە لەخۆ دەربازکردن بەرەو کەناری خۆ ڕازیکردن بەلۆجیکی ناڕاست ناچێتە چوارچێوەی پێناسێکی ترەوە.

## ئایا خۆشەویستیی نموونەیی یان خاوێنبوونەوە یان تیۆری؟

هەموومان کۆکین لەسەر ئەوەی کە خۆشەویستی لە عەقڵی ناوەوە دروست دەبێت لە میانەی پێوەندیی تاکە کەسەوە بەدەوروپشت، ئەگەر لە (سوشر)ی زاناش بپرسین پێمان دەڵێ: (کێ یاسا بۆ خۆشەویستی دادەنێت، خۆشەویستی لە هەموو یاساکان مەزنترە کە مرۆڤ بۆ دانیشتوانی سەر ڕووی زەوی داڕشتووە)، بەمەبەستی گەیشتن بەو دەربڕینە و زانینی هەبوون و نەبوونی خۆشەویستیی بێگەرد پێویستە بگەڕێینەوە بۆ داستان و چیرۆکە دیرۆکییەکان، کە دیارە عەرەب خۆی دەکات بەخاوەنی ئەو بەخشندەییبیە و لە سەرچاوە و وتوێژەکانیاندا شانازی بەوەوە دەکەن کە خۆشەویستیی بێ گەرد (العذري) لە قەبیلەی (بني عذرة)وە سەرچاوەی گرتووە کە نیشتەجێی باشووری حیجاز لە (وادي القرى) بوون، کەوتووەتە نێوان (تێما و خەیبەر)ی پڕ لە دارخورما و دارستان و سەوزایی، گوایە بەهۆی ئەو دیمەنە سیحرئامێزەی و بەختەوەرییان لەڕووی بژێویی ژیان و بێ شەڕوشۆڕی لە ناوچەکەیاندا، خەڵکی ئەو هەرێمە خەڵکانێکی هەستیار بوون، لەبەر ئەو هۆیە هەر لەوێشەوە شیعری لیریکی سەری هەڵداوە، گۆرانییەکان پڕ لە سۆز و خەم بوون بەرامبەر بەخۆشەویستی و ئەو سۆزە بەتینەش پاڵنەر بووبێت بۆ ئەوەی مردنی بەکۆمەڵیان تێیدا بڵاوبێتەوە لەپێناوی خۆشەویستیدا، ئەوەشیان لە میانەی ئەو پرسیارکردنەوە دێت کە جارێک لە پیاوێکی (بني عذرة) بەناوی عەروە بن حەزام ئەلعەزری دەپرسن: تۆ لە چ قەبیلەیەکیت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ من لەو قەبیلەیەم کە عاشق بن دەمرن، بەرامبەرەکەشی سوێندی دەدات کە ڕاستە ئەوان



خاوەنی ناسکترین و هەستیارترین دڵن، لە وەڵامدا دەڵێ بەڵێ سوێند بەخودا ۳۰ لاوم بەجێ هێشت کە مەرگ دایپۆشیبوون و هیچ دەرمانێکیشیان نەبوو جگە لە خۆشەویستی، پرسیارکەریش پێی دەڵێ چۆنە عەشق دەتانکوژێت ئەی کۆمەڵی بەنی عەزرێ؟! لە وەڵامدا دەڵێ چونکە بێگەردمان دەکاتەوە و بێگەردیش دەمانکات بەخاوەنی دڵی ناسک و، عیشقیش خۆشەویستییە پاک (عذري)یەکەمان دەنەخشێنێ (یاخۆ دەڕازێنێتەوە).

ئەگەر لە ناوەڕۆکی ئەو گفتوگۆیە وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەمان تیۆریی ئەفلاتون کە چاندنی خێر و پەسەندییە لە مرۆڤدا بەرەو نموونەیی بردن، بەڵام لای ئەفلاتون بەتیۆری داڕێژراوە و لای ئەو قەبیلە عەرەبییە بەکردار، گەرچی من لەگەڵ ئەوە نیم ئەوان سەرچاوەی ئەو بێگەردی و خۆشەویستییە بەتینە بن، چونکە ئەگەر باسی نێوان (ترستان و ئەیزولد) کە یەکەم داستانی ئەوروپییە بکەین بۆمان دەردەکەوێت لەو خۆشەویستییەی لای بەنی عەزرە هەبووە لای هەردوو پاڵەوانی ئەو داستانە بەهێزتر و بێگەردتر بووە، ئەویش لە میانەی خۆشەویستیی نێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵەوە سەرهەڵدەدات، ئەو کاتەی پاشایەک بەناوی (مارک)، (ترستان) دەنێرێت بەشوێنی ئەیزۆڵددا بۆ ئەوەی بیگەیەنێت بەکۆشکی پاشایەتی لەوێ لەگەڵ پاشادا زەماوەند ساز بکەن، بەڵام خۆشەویستی دەکەوێتە نێوان هەردوو لایان واتە ترسان و ئەیزۆڵدەوە یاساکانی کۆمەڵ و جیاوازییە چینایەتییەکان و ئەو بێگەردیی خۆیان ئەو خۆشەویستییەش ناگەیەنێت بەئاکام. وەکو لە چیرۆکەکەدا هاتووە کاتێک دەگەن بەجێگەیەک کە هەردووکیان بەیەکەوە دەخەون شمشێرێک دەخەنە نێوان هەردووکیان هێما بە بێگەردی یاخۆ پاکی، ڕۆمانی مردن لە بوندوقییەی نووسەری ئەڵمانی تۆماس مان هەمان جۆر خۆشەویستی ژیانی پاڵەوانەکەی بەمەرگ دەسپێرێت، مەدام بۆڤاریش (فلۆبیر) بەو کولێرەیە نەمرد کە هەڵنەدەهات لەبەری بەڵام هێندە بەدووی ئەو

خۆشەویستییە ڕۆمانسیەدا گەڕا کە دەربارەی خوێندبوویەوە و بەدوایدا گەڕابوو تا دواجار لە ئەنجامی بەواقیع نەبوونی ئەو خەونە خۆی کوشت. هەروەها ئەو داستانە لای کوردیش بەمەم و زین و خەج و سیامەند و وەلی دێوانە و شەم و لای دراوسێکان بەلەیلا و مەجنون و شیرین و فەرهاد، شێخی سەنعان، جەمیل و بوسەینە، قەیسی دریح و عروەی حەزام... هتد. کۆتایی دێ.

کەواتە هەر لە سەرەتاوە مێژووی مرۆڤایەتی و هەستکردنی بەژیانی هاوبەش هەردوو چمکی خێر و شەڕ لای مرۆڤ لە خۆشەویستیدا بەرجەستە بووە، هەریەک لەم نموونانەش ڕاستی و دروستی تیۆرییەکەی ئەفلاتون و خۆشەویستی ئەفلاتونی و خۆشەویستی بێگەرد دەسەلمێنن کە لای سەرجەم نەتەوەکان هەبووە و لای هەمووشی یەک سنوور بێگەردیی خۆشەویستییەکەی کێشاوە، ئەویش بەیەک نەگەیشتن و دوورخستنەوەی جەستە بووە لە خۆشەویستی، هیچ کام لەو پالەوانانە لەڕووی جەستەییەوە نەگەیشتوون بەیەک و بێگومان گەر بشگەشتنایە بەیەک نەدەبوون بەپالەوان و دەبوون بەژیانێکی ئاسایی کە لای هەزاران کەس ئامادەییی هەیە، ئیتر تا چەند ئەو داستانانە هەقیقەتن یان تەنیا نووسراو، ئەمە شتێک لە تیۆرییەکە بەباش یان خراپ ناگۆڕێت، چونکە لێرەدا مەبەست لەو هەستە و لەو خواستەیە کە هەبووە بۆ خۆشەویستی و شێوەکانی ئەگەر لە ڕوانگەی نووسەرێکیشەوە بێت، دوایی ناتوانین ئەو داستانانە تەنیا بەنووسراو بزانین نەک بەهەقیقەت، چونکە وەکو دەبینین لە شارستانییەتی ئەوروپی و یۆنان و کورد عەرەب و فارسیشدا هەریەک بابەت بووە بەهێمای خۆشەویستی بێگەرد (عذري) ئەویش قەدەغەبوونی پێوەندیی لەشی و بەیەک نەگەیشتنی خۆشەویستەکانە، کەواتە لە زەمەنی یاساغی و نائاشکراییدا بەها ڕۆحییەکانی خۆشەویستیی بێگەردی دارشتووە، نرخیشی زیاتر بووە، ئەو کاتەی خۆشەویستی ئاشکرا دەبێت و پالەپەستۆ و یاساغییەکانی لەسەر هەلدەمالرێت ئەو بەهایە لە دەست



دەدات، بەلام ئایا تەنیا ئاشکرابوون و ئاسایی بوونی خۆشەویستی بەس بوو بۆ ئەوەی مرۆڤ جوانترین هەستی مرۆڤایەتی لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی جەستەیی و مادییەکاندا ببینێتەوە؟! یاخۆ ئازادیی سێکسی یەکێک بوو لە هەلوەشێنرەوانی فەلسەفەی خۆشەویستی؟

## دژ و تەبایی خۆشەویستی و سێکس

بەپێی بیروبۆچوونی زۆرێک لە زانیان و پسپۆڕان و شاعیرانی سەردەمی کۆنیش هەریەک بەشێوەیەک گوزارشتی لە خۆشەویستی کردووە، هەندێکیان خۆشەویستیی لە سێکس جیا دەکاتەوە و هەندێکیشیان سێکس بەبناخەی خۆشەویستی دەزانێت. کە دیارە لە هەردوو دۆخدا بەپێوەری کێشە شارستانی ئابوورییەکان بەرزی و نزمی لەو بۆچوونانەدا ڕووی داوە، بەلام لە بنەمادا هەردوو چمک خزمەتی پێوەندیی مرۆڤایەتی و دۆزی ژیان و پێویستییە مرۆڤایەتییەکان دەکەن، دەکرێ لە پراکتیکدا و لەڕووی مێژووییەوە سێکس بەر خۆشەویستی کەوتبێت، بەلام ئەو کاتە پرۆسەی ئەنجامدانی بەربەرییانە و وەحشیگەرییانە بووە و سەرەتای دۆزینەوەی هەستکردن بەپێداویستییە لەشییەکان بووە لای مرۆڤ، کە زۆرجار ئەو کردەیە بەشێوەی زۆر و داسەپاندن بووە، واتە زۆرکردنی پیاو بۆ بەزۆر دابینکردنی ئەو پێویستییە لە شێوەی ئیغتسابدا، چونکە سەرەتای دۆزینەوەی ئەو پێداویستییە هەستێکی بەڕێکەوت خوولقاو بووە و ئەنجامدانی پرۆسەکەش لە بنەمادا لەپێناوی لەزەت وەرگرتندا بووە نەک وەکو پرۆسەیەکی مرۆییی نێوان دوو کەس کە پنتەکانی ژیانی لەسەر وەستاوە و ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیە دەبێت بەهۆی دروستبوونی مرۆڤێکی تر، تەنانەت زۆر درەنگ زانیویانە کە ژنیش لەو پرۆسەیە چێژ وەردەگرێت، کاتی زۆرکردنی پیاوان وایان زانیوە پرۆسەیەکی یەک لایەنەیە، بۆیە پرۆسەی سێکس بەبێ بنەما قوولەکانی خۆشەویستی هەتا ئێستاش هەر بەو بەربەرێتییە دەدرێتە قەلەم، بەشی دووەمی خۆشەویستیش کە دەتوانم

تەنیا ناوی بنێم بەرژەوەندیی خواست لە بەرگی خۆشەویستیدا و ئارەزووی وەحشیگەرییانە لە سیمای سۆزداریدا جگە لە دووبارەکردنەوەی ئەو پرۆسە سەرەتاییانە کە مرۆڤ تێدا نائاگا بووە لە سەرجەم پرۆسەکانی ژیان، بەربەرییانەش ژیاوە هیچی دیکە نییە و تەنانەت کاتێکیش فرۆید هەموو هەڵسوکەوتێکی مرۆڤی وا مەزەندە کرد کە پاڵنەرێکی سێکسیی لەپشتە، پاش ماوەیەک تیۆرییەکەی ڕەت کرایەوە و هەتا ئێستاش تیۆرییەکە متمانەبەخش نییە هێندەی یەک چیرۆکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی وەکو ڕۆمیۆ و جولێت، دۆن کیشوەت و دلینیا بەزیندوویی لە هزر و ئەندێشەی مرۆڤدا نەمایەوە و کاریگەریی نەبوو.

مرۆڤ بەتەواوی هەست بەو دووفاقییەتە دەکات کە بەرامبەر چمکی خۆشەویستی و زایەندی لە مێژووی کۆن و نوێدا دروست بووە، گەر بەمێژووی کۆنیشدا وردبینەوە، دەزانین لە سەدەی حەوتەمەوە پاڵەوانێکی خۆشەویستیی پاک و بێگەرد هزری خوێندەوارانی ئەو سەردەمەی بردەوە بۆ فەزا جوانەکانی سۆز و جیهانێکی یوتۆپی کە مرۆڤ بەخەونییەوە دەژی هەتا ئەو سەردەمەی بەزەللەی واقعێکی تر بەئاگا دێت، ئەویش ناوبانگی ئیرۆس بوو کە وەکو مەزەندە کراوە ئەو کاتەی شاعیری ئەغریقی (هستۆد) وتی (کرنیۆس) کە گیانی ڕۆژگار و زەمانە بووە ئیرۆسی لێ کەوتەوە (لەو کاتەوە ئیرۆس بوو بەهێمای خۆشەویستی، ئەو هێمایە کاریگەرێکی وای لە هەستی خەڵک و چینی ڕۆشنبیرانیشدا هەبوو کە (هۆمیرۆس)ی شاعیر لە (ئەلیادە)دا لە میانەی خۆشەویستی نێوان (ئەخیل و نیترس)دا جارێکی تر دای ڕشتەوە بەڵام بەرەو نزمتر لەو ئاستەی هستۆد بەرۆحی بەخشیبوو کە دووەمیان تەنیا بەخواوەندی ئارەزوویی چواندبوو، ئەو چواندنەش لەگەڵ شاعیرەکانی تردا بەرەو نزمتر ڕۆیشتووە، هەتا گەیاندیان بەو چیرۆکانەی خیانەتی هاوسەری و لەشفرۆشی بەرەزامەندیی مێرد و پاڵەوانی ئەو داستانانەی کە ژنی هاوڕێکەی دەرفێنێ و کاتێکیش دەگەڕێتەوە وەکو ئەوەی هیچی نەکردبێت بەشێوەی ئاسای مێردەکەی



مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، واتە گەیاندیان بەو ئاستەی ئێستا بەشێوەیەکی فراوان بڵاوە لەنێو کەڵچەرە جیاوازەکاندا، ئیتر ئەو نووسین و داستانانەی ئەوان ڕووداوی ڕاستی و واقیعی کۆمەڵی خۆیان بووبێت، یان پێشبینی بەڕووداو و ئاسایی بوونەوەی ئەو چمکانە، ئەوانە بەهەردوو لایان پاڵنەرێک بوون بۆ ئەوانەی کە ئەو ئارەزووە دەکەن خەڵکانێک هەیە و هەبووە وەکو ئەوان، نوقڵانەیەکیش بوو بۆ ئەو ئاڵوودەبوونەی ئێستا کۆمەڵگاکان ئاڵوودەی بوون، سەرجەم هزری زانایان و فاکتەرە یاساییەکان و هێزی پۆلیسیش نەیتوانیوە چارەسەرێکی شیاوی بۆ ئەو دیاردەیە پێ بێت و شتێک لەو هەموو کێشەیەی لەناو کۆمەڵدا بەهۆیەوە دروست بووە کەم بێتەوە، یان لایەنی کەم وای لێ بکرێت قازانج و زیانەکانی یەکسان بکرێت، نەک هەمیشە زیانەکانی هەزاربار بێت.

## لەشفرۆشی، ئازادیی سێکسی یان خیانەتی هاوسەری؟!

ئەو سێ فاکتەرە هەرسێکی دەرئەنجامی کۆمەڵێ پاڵەپەستۆی دەروونی و کۆمەلایەتی و ئابووری و تەنگژەی ڕۆشنبیرییەوە تووشی مرۆڤ دەبێت، ئەنجامدەری هەرسێ فاکتەریش نێر و مێن بەتێکڕا بەڵام زیاتر مێینراوە واتە (تأنیث) کراوە و بەبەری ژن بڕاوە، ئەمەش لە شارستانییەتییەکەوە بۆ یەکی تر جیاوزە، بۆ نموونە لە وڵاتێکی ئەوروپیدا کەمتر بەتاوان یان بەکردەیەکی ژنانە دەژمێردرێت هەتا وڵاتانی دواکەوتوو لە نێویشیاندا کورد کە بەو دوایە ئەو سێ فاکتەرە لەناو کۆمەڵیدا تەشەنەی کردووە.

## لەشفرۆشی

لەگەڵ ئەوەی لەشفرۆشی بەکۆنترین دیاردە ناوزەدکراوە و هەر لە سەردەمی بابلیۆن و سۆمەرییەکان لە کەشوهەوای پێشوازیی مەلیکانەدا بەکار هاتووە بۆ ڕێزگرتن لە میوانەکانی پاشا، هەروەها لەنێو قوبرسدا باندی سێکسفرۆشی هەبووە و نارده و هاوردەیان لەگەڵ ڕۆمانیای ناسراو

بەسێکسفرۆشی کردووە، پاشان قوبرس لەم ڕووەوە ناوبانگێکی دەرکردووە لە میانەی بازرگانی سێکسییەوە ناویان ناوە (دەفری بازنەیی) مەبەست لەوەبوو کە وەکو بازنەیەک هێڵی بازرگانیی سێکسیی کێشابوو بەچوار دەوری جیهاندا و تەنیا وڵاتێک بوو کە تەنیا بە٦٠٠ هەزار کەس دانیشتوانەوە زیاتر لە ١٠٠ یانەی سێکسفرۆشیی تێدا بوو، جگە لە گەورەترین باندی هاوردە و بردەی بازرگانیی سێکسی و دابەشکردنیان بەپێی مۆدیلی ناوچەکان بەسەر ژنی سپی و ژنی گەنم ڕەنگدا، بەو شێوەیە نیوەی ژنان و کچانی پێشاندراوی نێو جامخانەکانی قوبرس لە وڵاتانی تایلەند، بولگاریا، پۆڵۆنیا و دانیمارک و فلیپین پێک هاتبوون، هەتا ئەو بازرگانییە بەهێزەی قوبرس زۆرێک لەو وڵاتانەی کە بازرگانی لەگەڵدا کردبوون بوون بەسمبولی ئەو کارانە تەنیا لە فلیپیندا ٥٥٠ هەزار ژن کاری سێکسفرۆشییان دەکرد و سویسرا بەبەهەشتی مەلها ناسرا و تایلەند بەبەهەشتی سێکس لە جیهاندا و وڵاتانی تر ئەوروپا و ئیسرائیلیش لەو دیاردانەیە بێ بەش نەبوون، ئەو بازرگانییەش دوای جەنگی جیهانیی یەکەم تەشەنەی کرد.

کەواتە بازرگانیی سێکسی و لەشفرۆشی پلانێکی برجوازییانەی بازرگانەکان بووە بۆ وەدەستهێنانی ئەو سەفقانەی کە هێزی برجوازیی باڵاتر و مرۆئامێربوونیش لەبەردەم ئەو هێزەدا شەرعییەتی زیاتر وەردەگرێت، بەها نزمتر دەنوێنێت، بەقازانجکردن و قۆستنەوەی هەلومەرجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، ئەو پرۆسەشیان ناونا ئازادیی سێکسی، بەمێژووی تەشەنەکردنیشیدا بۆمان دەردەکەوێت کە باری ژیان و نائارامییە دەروونییەکان بەهۆی شەڕ و لایەنی ئابوورییەوە دەستێکی باڵای هەبووە لە بەرجەستەکردنی ئەو دیاردەیە لەنێو کۆمەڵە جیاوازەکاندا. ئەو کاتەی مرۆڤ گیرفانی بەهۆی چنگی بازرگانەکانەوە دەدورێت و ناتوانێت یەکەی کڕین و فرۆشتنی تێدا بدۆزێتەوە لەشی دەخاتە پێناوی ژیانەوە، بەتێبینیی ئەوەی کە بازرگانییان تەنیا بەژنانەوە نەدەکرد بگرە بەکۆمەڵێ کوڕی



هەرزەکار و مێرمنداڵیشەوە دەکرد و هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە... هەر لەوێشەوە ئەو وشەیە هەڵقوڵاوە چونکە گەر لە وشەکە بنوارین: لەش + فرۆش یان فرۆشی واتە لە دوو بڕگەی واتادار پێک هاتووە کە یەکەمیان ئامادەبوونی لەشێکە لە وێنەی کاڵایەکدا بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجێک، بڕگەی دووەم کە دۆزینەوەی کڕیارە بۆ فرۆشتنی، ئەم پرۆسەیەش پێم وایە ئارەزوو ڕۆڵ نابینێت هێندە پێویستییە ئابوورییەکان ڕۆڵ دەبینن، جگە لە چەند هۆکاری تر کە ئەوانە زیاتر لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکادا کاران، لەوانەش مەجبوورکردنی ژن بەکاری لەشفرۆشی یاخۆ سێکسفرۆشی، وەکو هەندێک لەو ژنانە کە ڕێکخراوێکی دیاریکراو لە وڵاتێکی پڕ شەڕ و برسییێتییەوە هێناویەتی، بەڵام کاتێک دەگەیەنرێن بەوڵاتی مەبەست کە وڵاتانی ڕۆژئاوایە بۆیان دەردەکەوێت ئەو ڕێکخراوە خێرخوازی نییە بگرە باندێکی سێکسفرۆشییە و لەژێر ئەو ناوانەدا کاریان کردووە هەتا ئەو ژنانە دەگەیەنن بەشوێنی مەبەست و لەوێ دەیانخەنە ژێر باری قەرزی زۆر و توندوتیژی و چەوساندنەوە و بەکارهێنانیان وەکو باندی سێکسفرۆشی و بازرگانیکردن، هەروەها هەندێک بەهۆی خەڵکانی سێکسفرۆش لە غەفڵەتدا تووشی تلیاک خواردن، هەندێکیشیان خۆیان بەئارەزوو تووشی خواردنی دەرمانە سڕکەرەکان بوون، تەنیا ڕێگەچارەش بۆ ئەوەی لەو دەرمانە دانەبڕێت خۆفرۆشتن و سێکسفرۆشتنە، هەندێ جاریش بەهۆی زۆری پیاوەیە وەکو لەناو کۆمەڵی کوردیدا چەندین جار دانپێدانانی ژنانم خوێندووەتەوە ڕێژەیەکیان دان بەوە دادەنێن کە هاوسەرەکەی پاڵنەرێتی یان زۆری لێ دەکات و هەندێکیان مەترسیی ئەوەیان لەسەرە ئەگەر ئەو پێشنیازە لە هاوسەرەکانیان قەبووڵ نەکەن ئەوا لەناو کەسوکار و کۆمەڵدا ئەو تاوانبار دەکات بەداوێن پیس و تەڵاقی دەدات و کۆمەڵیش باوەڕ بەو دەهێنێت، مادەم هاوکێشەکەش وا دەکەوێتەوە با لەشفرۆش بێت و لای مێردەکەم باش بێت بۆ ئەوەی کۆمەڵ باشی پێ بڵێت هەتا ئەوەی بەکەرامەتەوە بژی و بەهۆی قسەی مێردەکەی خراپەی پێ بڵێن. ئەم جۆرە

خۆفرۆشتنه لای من ئازادیی سێکسی ناکات، ئەو گرێ دەروونییەش نییە کە چارەسەر نەکرێت. تاوانیشی لە شانی دەسەڵاتی سیاسی و یاسایە بەر لە یاسا کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان.

## ئازادیی سێکسی

هەندێکی تر لە ژنان بەخۆڕایی لەپێناوی لەزەتدا سێکس دەکەن دەتوانم ئەمەیان ناوبنێم ئازادی سێکس، بەڵام ئەویش هەتا ئەو سنوورەی کە ناگات بەفرەیی واتە کاتێک سێکس لە یەک تێدەپەڕێت بۆ چەندین کەسی جیاواز لای ژن بێت یان پیاو ئەوەیان غەریزەی وەحشیگەریانەیە، ئارەزوویەکی دەرەوەی لۆجیکی مرۆڤانەیە بۆیە کاتێک مرۆڤێک ژن بێت یان پیاو ڕێگە بەخۆی دەدات چەندین پێوەندی سێکسی هەبێت و ناوی دەنێن ئازادی سێکس بەبڕوای من هیچ پێوەندییێکی نە بەئازادییەوە هەیە نە بەپێوەندییێکی سێکسی مرۆڤانەش، پێویستە مرۆڤ چ پیاو بێت یان ژن جیاوازی لەنێوان ئازادی و بەڕەڵایی، بێ پڕۆگرامی و بێ هەبوونی دیدێکی مەعریفی بکات، بزانێت ئەوەی ناوی ناوە ئازادی سێکس جگە لە پەردەپۆشکردنی دەروونێکی ناساغ چی دیکە نییە، من لە بنەمادا باوەڕم بەوشەیەک نییە ناوی ئازادی سێکسی بێت، مادام هیچ کام لە ئێمە بۆ هاوسەرەکەی یان خۆشەویستەکەی ئەو ئازادییە ناخوازێت، بۆ خۆی نەبێت، واتە ئەو ژنەی پراکتیکی ئازادی سێکسی دەکات لە هەمان کاتدا پێی خۆش نییە هاوسەرەکەی ئەو کارە بکات، هەروەها سەبارەت بەپیاو نەک هەر ڕاستگۆ نین لەو مەسەلانەدا بەڵکو تا ئەوپەڕی مەوداکان کەسایەتی دووفاقیشن، چونکە دەبینین ئەو پیاوانەی لەگەڵ ژنێکدا باس لە ئازادی سێکسی دەکەن بۆ ئەوەی لەگەڵیدا دەستەبەری بکەن لە هەمان کاتدا ئامادە نییە ئەو کەسە ببێت بەخێزانی یان هەمان ئازادی بۆ خوشک و کچ و دایک و خێزانی خۆی دەستەبەر بکات، کەواتە ئازادی سێکسی شەرعییەتێکی باوەڕپێکراوی لە دەروونی هیچ ڕەگەزێکدا نییە، جگە



لەوەی هەر مرۆڤێک هێندەی هۆشیاری هەبێت بزانێت ئەوەی ناوی ناوە ئازادی سێکسی بازرگانی سێکسییە و بەپلانی دەزگا گەورە و برجوازی و دژە مرۆڤەکان دانراوە بۆ کۆیلەکردنی مرۆڤ لە داوێنی سیستەمە مادی و بازرگانییەکاندا کە واتای بوون و بەرژەوەندی ئەوان دەکات هەرگیز باوەڕ بەو پرۆسەیە و مل بۆ ئەو پرۆسەیە نادات، پێ لەسەر هەمان ڕای خۆم دادەگرم و ئەو کێشانەی ئەمڕۆ وڵاتە پێشکەوتووەکانی پێدا تێدەپەڕێت و یاد دەهێنمەوە لە نەخۆشی کوشندە و منداڵی نامەشرووع لەبەر هەڵوەشاندنەوەی خێزان و ژیان و جۆرەها نەخۆشی دەروونی و لە بەها کەوتنی پیرۆزییەکانی ژیان، کە لە ئاکامی سێکسفرۆشی و ئازادی سێکسییەوە هاتووە چ بەرژەوەندییەکی مرۆڤ و مرۆڤایەتیی تێدا بووە، جگە لە قازانجی ئەو کۆمپانیا گەورانەی کە لە هەموو کارێکی تر زیاتر قازانج لە فرۆشتنی دەرمانەکانی کۆنترۆڵی سکپڕی و لەباربردن و نەخۆشییەکانی ئەندامی زاوزێ و نەخۆشییە سێکسییەکان و کۆندوم دەفرۆشن. بۆیە دەبینین ژمارەیەکی باشی ئەوروپییەکان بەڕاستیان زانیوە کە جیاوازیی نێوان بەرەڵاییی دەروونی وەحشیگەرییانە و ئازادیی سێکسی و لەشفرۆشی چییە و گەراونەتەوە بۆ ژیانێکی نۆرماڵ و دوور لە درۆکانی بازرگانیی مۆدێرنە کە گوایە ئازادیی سێکسی زۆر کێشەی دەروونی و ئازادییەکانی تر چارەسەر دەکات و خۆیان و منداڵەکانیان لەسەر ژیانێکی دروست دوور لەو وەهمانە ڕاهێناوە و بایەخیان خستووەتە سەر بەها ڕۆحی و مرۆییەکان کە خۆشەویستی و قەناعەتی پاکە، تەنانەت لەم وڵاتانەدا هێندە لە نرخی کەم نەکراوە کە بگوترێ سێکس کردن بگرە دەگوترێت خۆشەویستی دروست بکەین، واتە ئەوەی لای کورد پێی دەگوترێ لەشفرۆشی یان فرە سێکسی لای خۆرئاواش هەر نەفرەتی لێ کراوە و پێی نالێن خۆشەویستی دروستکردن بگرە پێی دەڵێن واتە سێکسفرۆش Prostiute یان سێکسکار Sex work لێرەوە دەڵێم بەوانەی کە شتێکی نابەجێ دەکەن و ناوێکی بۆ دەدۆزنەوە لە چمکە

ڕۆژئاواییەکانن گوایە ئەوەی کردوویەتی لە پێشکەوتنەوەیە ئەوە هیچ ڕاست نییە تەنیا بیانوویەکە بۆ خەڵەتاندنی خۆیان نەک دەوروبەریان، چونکە دەوروپشت زانیویەتی بووە بەخۆراکی کام جۆرە پلانی دژ بەمرۆڤایەتی.

## خیانەتی هاوسەری

جۆرێکی تر سێکسکردنی نامەشرووع لە ڕێگەی خیانەتی هاوسەرییەوەیە، ئەم جۆرەش لای پیاوان باوترە هەتا ژنان، کەچی ژنانی زیاتر پێ تاوانبارە هەتا پیاوان، کە ئەوەش پابەندی ڕادەی پێشکەوتن و دواکەوتنی ڕۆشنبیرییە، لای ژنانیش پاڵنەر و هۆکاری زۆر هەن بەڵام لای پیاوان زیاتر بەهۆی چاوچلێسی و ماف دانە بەخۆی گوایە پیاوەتیی خۆی تێدا تاقی دەکاتەوە و چەندین هۆی تر کە کاری من نییە لەم نووسینەدا، بگرە دەمەوێ ئاماژە بۆ ئەو پاڵنەرانە بکەم کە ژن لە خیانەتی هاوسەری نزیک دەکەنەوە، لێرەدا قسەیەکی دوکتۆر عادل حوسێن عەبدوڵڵام وەبیر دێتەوە کە لە دیدارێکدا زۆر ساکارانە دەربڕینێکی زانستیی قووڵ دەخاتە دەستی پیاوان و گوزارشتەکە وایە کە (ژن خیانەت ناکات ئەگەر پیاو گەواد نەبێت) ئەو دەربڕینە گەرچی ناشیرینە بەتەواوی بەشێوەیەک دەربڕاوە کە پیاوێکی نەخوێندەواریش تێ بگات ژنەکەی خیانەت ناکات ئەگەر ئەو مرۆڤ بێت، ئەو خاوەنی کرداری دروست و، هەڵسوکەوتی دروست بێت، ئەم بۆچوونەش لە هەڕەمەکییەوە نەهاتووە و قسەی کەسێکی پسپۆڕی ئەو لایەنە و سەرجەم زانایان و زانستی دەروونیش ئەو ڕاستییەی سەلماندووە کە خیانەتی هاوسەری لەلایەن ژنەوە نزیک بەڕێژەی ١٠٠٪ پیاو تاوانبارە، بۆ ئەوەی زیاتر جەخت لەسەر چۆنیەتیی تاوانباربوونی بکەین و پیاوانێک وا نەزانن تەنیا ڕایەکی هەڕەمەکییە پێم خۆشە پێداویستییە ڕۆحی و گیانییەکانی نێوان مرۆڤ کە لە چەندین کردە و فاکتەر و جووڵە پێک دێت بکەم بەچەند خانەیەکەوە، چونکە مرۆڤ جووڵەیەک، وشەیەک



بەرەو خۆشەویستی دەبات لە هەمان کاتدا جووڵەیەک وشەیەک بەرەو ڕق و خیانەتیشی دەبات.. گەر بڵێین ئەو خانانە پێک هاتووە لە ١٢ خاڵ، دەبینین لە هەموو خاڵەکان گرینگتر خانەی پێوەندیی سێکسە.

پێوەندیی سێکسی لەنێوان ژن و مێرددا لە سەرجەم خانەکان و خاڵەکانی تر هاوپێچەکانی زیاتر کاریگەرییان بۆ سەر پێوەندی و خۆشبەختی و بەدبەختیی ژیانیان هەیە، ئەگەر ژن لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لەڕووی سێکس و مەسەلە ڕۆحییەکاندا بەختەوەر بێت، هەرگیز بیر لە خیانەت ناکاتەوە، ئەگەر مەسەلە مادییەکانی لە لووتکەی تەنگژەشدا بێت، ئەو پیاوانەی ڕۆشنبیریی سێکسی و ڕۆشنبیری خوێندنەوەی دەروونیی ژنیان کەمە هەرچییەک بێت پایە و پلە و خوێندەوارییان تووشی ئەو خیانەتە دەبنەوە، چونکە پێوەندیی نێوان ژن و مێرد کردارەکانی نێوان خۆیان دەستنیشانی دەکات نەک کار و پیشە و بڕوانامە و... هتد، زۆریشن ئەوانەی خاوەنی بڕوانامەی بەرز و شێوەی جوان و ڕەزامەندی کۆمەڵن ناتوانن ژنەکانیان ڕازی بکەن، بەڵام کەسێک بەزۆر دەتوانێت ئەلفوبێ لە یەک جیا بکاتەوە ژنەکەی بەختەوەر دەکات، ئەمەشیان من دەیگەڕێنمەوە بۆ بنەمای خۆشەویستی لای پیاو بەرامبەر ژنەکەی، ئەو پیاوەی ژنەکەی خۆش دەوێت هێندەش بەدووی زانستەکاندا دەگەڕێت بزانێت چۆن مرۆڤێکی خاوەن عەقڵێک بێت کە ژنەکەی لێی ڕازی بێت، یان لە دەستی نەدات، یان ڕووبەڕووی خیانەتی هاوسەریەتیی نەکاتەوە کە لەم خاڵانەی خوارەوە پێک هاتوون.

١- نوێکردنەوەی هەمیشە پێوەندی لەگەڵ ژنەکەی لە ڕێگەی ڕۆژانە دەربڕینی نوێی خۆشەویستی، وەکو ئەوەی پیاوێک لەخۆی بپرسێت ڕۆژی چەند جار بەژنەکەی دەڵێ خۆشم دەوێت، چەند جار دەڵێ بەقوربانت بم، چەند جار دەڵێ هەموو شتێکی لە ژیانمدا و... تاد.

٢- جۆری پراکتیکی سێکسی کە زۆرجار پیاو تەنیا وەکو ئامێرێک ژن بەکار دەهێنێت بۆ بەتاڵکردنەوەی غەریزەکانی خۆی و گوێ نادات

بەخواستی ژنەکەی یان تێربوونی ژنەکەی، بەتایبەت بۆ پیاوی کورد گوێ نادات بەوەی کە ژنەکەی لەنێو کولتوورێکدا گەورە بووە کولتووری شەرم و بڤە هەرچەندە ناڕازیش بێت لە جۆری سێکس کردن لەگەڵیدا دەری نابڕێت بگرە تەنیا بەڕوخسار و مامەڵەیەوە دیارە.

٣- زۆرێک لە پیاوان هەتا ئێوارە دڵی ژنەکەیان ڕەنجاندووە، بەڵام لە ئێوارەدا دەیانەوێت ژنەکانیان ببێت بەپاڵەوانی فیلمە ڕۆمانسییەکان و جوانترین جووتبوونی لەگەڵدا بگۆڕێتەوە.

٤- هەندێک لە پیاوان خۆیان توانای سێکسیان کەمە و هەموو تاوانەکەش دەدەنە ئەستۆی ژنەکەیان و، سووکایەتی کردن پێیان کە ژنانێکی نەزایەندین لە پێوەندیی ژن و مێردایەتیدا.

٥- جۆرێکی تر پیاوان تا ئێوارە بەهیوا و کار و خۆزگەکانی خۆیان خەریکن و ژنەکەیان فەرامۆش کردووە ئێوارە و کاتی جووتبوون، دەیانەوێت ژنەکەیان لەپڕ ببێت بەخاوەن هەست و خەیاڵی نەچێت بەلای پاڵەوانێک کە لە خەیاڵی خۆی دروستی کردووە و بۆشاییەکانی بۆ پڕ دەکاتەوە، یان هاوسەری ئەو هاوەڵەی کە باسی مێردەکەی بۆ کردووە چەندی خۆش دەوێت و چۆن خۆشەویستی لەگەڵ دەگۆڕێتەوە و بایەخی پێ دەدات.

٦- هەندێک لە پیاوان کاتێکیان بۆ سێکس داناوە لە چ کاتێکدا بێت بەپێی ئامارەکانیش زۆربەیان جووتبوون دەخەنە شەوەوە، با مرۆڤ لە خۆی بپرسێت کاتێک هەموو ڕۆژێک دەوامی هەیە و هەموو بەیانییەک لە هەمان کاتدا دەچێت بۆ دەوام چەند لێی بێزار بێت و چەند چاوەڕوانی پشووی هەفتە دەکات؟ ئایا بەگاڵتە و بێ بۆچوونی پسپۆڕان ئەو پشووی هەفتەیە دانراوە؟ یان بۆ ئەوەی خۆی لەو ڕۆتینە ڕزگار بکات کە هەفتەکە تووشی هاتووە؟ سەیر نییە خەڵک بەشێکی گرینگی ژیانی خۆی کە فاکتەرەکانی تر لەسەر دەوەستێت بکات بەهەمان ڕۆتین و وەکو ئەوەی چۆن



سێ ژەمە لە کاتی خۆیدا نان دەخوات و کار دەکات و بۆ دیندار نوێژ دەکات ئاوا کاتێکی فەرمیکراویشی هەیە سێکسی تێدا دەکات، لای ژنەکەی دەیکات بەڕۆتینە کە واجبێکی خۆی جێبەجێ بکات نەک هەست بگۆڕێتەوە لەگەڵیدا.

٧- پێوەندیی بەر لە هاوسەری یەکێکە لەو فاکتەرانەی دەبێت بەهۆی خیانەتی هاوسەری لای ژن، لەوانەش زۆرێک لەو پیاوانەی کە ڕۆشنبیرییان لاوازە گۆڕانێکی زۆر لە کردارییاندا پێش هاوسەری و دوای هاوسەری ڕوودەدات، لەوانەش:

أ- بەر لە هاوسەری بەردەوام وشەی خۆشم دەوێی و قوربانیدانی لەسەر زمانە و پاش هاوسەری دەگۆڕێ بۆ سەرزەنشت و گلەیی، وا دەکات ژنەکەی پێش و پاش هاوسەری بەپێوەندیی نێوان ڕاوچی و نێچیر تێ بگات.

ب- بەر لە هاوسەری لەوانەیە لە شوێنی کارەکەیەوە دەیان جار تەلەفۆنی بۆ کردبێت، پاش هاوسەری یان ئەو مەسەلەیە بەتەواوی فەرامۆش دەکات، یان جارێک دەیکات، خۆ هەندێ لە پیاوان ئەو جارەش بۆ ئەوە دەکەن بزانن چییان هەیە بۆ خواردنی نیوەڕۆ یان ئێوارە. وا دەکات ژنەکەی هەست بکات درۆی لەگەڵدا کردووە و خۆشی ناوێت، یان کەسێکی تر لە ژیانیدایە و لەم بێزارە.

ج- زۆرجار پیاو بەر لە هاوسەری جۆرەها دیاری و یادگار پێشکەش بەژنەکەی دەکات، کە دەگات بەهاوسەری سەرجەمیان دەسڕێتەوە و هەرگیز بەدەستی بەدیاری ڕوو لە ژنەکەی ناکات، پیاوان هەڵەشن وا بزانن ژن دیاری لە نرخەکەیدا دەبینن، بگرە لەوەدا دەیبینن کە تا چەند لە بیری مێردەکەیدا بووە.

د- زۆرێک لە پیاوان بەر لە هاوسەری هەموو شتێکی ژنەکەیان لا جوانە لە پۆشاک پۆشین هەتا مامەڵە و ڕووخسار، داوای هاوسەری

قەدەرێک هەمووی دەگۆڕێ دەیکات بە نەشیاو ناشیرین، ئەمەش وا لە ژن دەکات بەدووی کەسێکی تردا بگەڕێت کە ئەمی پێ پەسەند بێت نەک پیاوێک کە هەتا پێگەیشتن ئەوی لا پەسەند بێت، چونکە ئەو کاتە سەرجەم سۆزی پیاوەکەی بەکەفوکوڵێکی سێکسیی کاتی بۆ پێگەیشتنی دەزانێت کە لە پێگەیشتنیدا کۆتاییيان هات، بۆیە ئەویش دەیەوێت بەخیانەت تۆڵەی ئەو درۆیەی لێ بکاتەوە و وا بکات لەو سێکسەدا کە هاوسەرەکەی ئەوی بەتەنیا تێدا بینییەوە کەسانی تریشی تێدا بەشدار بکات وەکو ئەوەی پێی بڵێ عافێتی ناکەیت.

٨- کۆمەڵێکی پیاوان پاش هاوسەری هیچ بایەخ بەپاکوخاوێنی و بۆنخۆشی نێو پێخەفی نووستنی خۆیان نادەن و لەناو جێگەشدا سۆزی بۆ ژنەکەی هەر هەتا پاش جووتبوونە و کۆتاییی دێ هەتا پرۆگرامە ڕۆتینییەکەی خۆی و شەوی داهاتوو.

٩- ژمارەی ئەو پیاوانە چەندن کە وا لە ژنەکانیان دەکەن و کە وا هەست بکەن شتێکی تەواو بەنرخ و تایبەتن لە ژیانی مێردەکانیاندا و ناگۆڕێتەوە بەهیچ شتێکی تر، هەتا چاوەڕوانی خیانەت لە ژنەکەی نەکات.

١٠- زۆرێک لە پیاوان خۆیان پێوەندیی تریان لە دەرەوە هەیە و وادەزانن ژنەکانیان نازانێت، بەڵام بەپێی زانستی دەروونی هەستەوەرترین مرۆڤ ژنە بەرامبەر کەسە نزیکەکانی ژمارەی ئەو دایکانە کەم نین کە زانیویانە و دڵی پێی گوتووە کوڕەکەی یان هاوسەرەکەی دەکوژرێت، ئایا پیاوان پێیان وایە پێوەندیی هاوسەرێتی نزیکتر نییە و زووتر بەوە نازانێ و بێ ئیرادە ئەویش بەلای ئەو خیانەتەدا ناگەڕێت؟

١١- ژمارەیەکی زۆری پیاوان چاولەدەرن و هەمیشە چاو دەگێڕن، ئەو چاوگێڕانە بەمەبەست بێت یان بێ مەبەست، واتە ئەو پیاوە بەدوای شتێکدا دەگەڕێت لە دەرەوەی ژنەکەی خۆی، یان بەشتێکی ژنەکەی ڕازی نییە و بۆ بەدیلی دەگەڕێت، کام ژن کە ئەو جۆرە کردارە لە پیاو ببینێت



هەست بەدڵنیایی دەکات و بیری ئەویش بۆ لای پیاوی تر ناچێت؟

١٢- جۆرێکی تر لە پیاوان لەڕووی ئابووری و بۆ سەرف کردن ژنەکەی پاش هەموو شتێک دێت، پاش خۆی، پاش منداڵ و شتی ناو ماڵ و تەنانەت کەسوکاری خۆشی. کام ژن هەست بکات پلە سێ و چوارە لە ژیانی مێردەکەیدا بەتایبەت لە کەسوکاری خۆشی گەر بەکردەوەش پێی نەکرا بیری بۆ خیانەتی هاوسەری ناچێت؟

١٣- کەم پیاو لە کاتی هاوبەشی جێگەدا گوێ دەدات بەشێوازی ڕاکشان و پرخە و بوونی هەناسە و... هتد، هەوڵ دەدات هەمیشە ئەو مرۆڤە بێت کە ژنەکەی دەیەوێ زیاتر و زیاتر لێی نزیک بێت.

١٤- هەندێک لە پیاوان لای کەسوکاری خۆیاندا هیچ نرخێک بۆ ژنەکەیان دانانێن. هەر هەڵە و کەموکورییەک هەبێت باسی دەکەنەوە یان وەکو ئەوەی لە ماڵەوە کرداری لەگەڵ دەکات لای کەسوکاریدا نایکات، بگرە لەلای ئەواندا توندوتیژتر و نامرۆڤانەتر دەجووڵێتەوە، خۆ جۆرێک لە پیاوان هەیە لەسەر قسەی کەسوکاری وەکو برا و باوک و دایک دەبن بەبڕیاردەری ژیانی ئەو، ئایە ئەم جۆرە پیاوە چاوەڕوانن ژنەکەیان خیانەتیان لێ نەکات؟ لە کاتێکدا هاوبەشەکەی ژیانی بەپلە دوو سەیری دەکات لە ژیانی خۆیدا؟ ئایە کورد لەوەتەی لە چوار پارچە مارەبڕاوە و بەپلە دووش سەیرکراوە هەمیشە بەخیانەتی نەزانیوە هەوڵی خیانەت و تۆڵەی لە بەرامبەرەکەی نەکردووەتە؟ دە دڵنیابە پیاوی غەفڵەتگیر ئەم مەسەلەیەش هەر وایە.

١٥- کەم لە پیاوان دەتوانن خۆشەویستی نوێ بکەنەوە لەگەڵ ژنەکانیاندا هەروەکو چۆن جلوبەرگ و شوێن نوێ دەکرێتەوە، بزانن کە ژنان زیاتر بایەخ بەخۆشەویستی ڕۆحی دەدات و پیاو بەلەشی، کەواتە چی بکات بۆ ئەوەی ژنەکەی هەمیشە وا هەست بکات ئەو کچەیە کە خۆشی ویستووە بەر لە هاوسەرێتی ویستوویەتی. نەک وا هەست پێ بکات کە

ژنێکە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکانی، ئەو سەردەمە تێ پەڕی.

١٦- جۆرێکی تر پیاوان ئەگەر ژنەکەیان خاوەنی بڕێک بێت لە مافە سەرەتاییەکانی خۆی وەکو خوێندن و کار و دیاردە شارستانییەکانی تر منەت بەسەر ئەرزدا دەکات، وای پیشان دەدات کە ئەوی مەزن هێندە ڕۆشنبیر و تێ گەیشتووە ئەو بەخشندەییەی هەبووە بەرامبەر ژنەکەی نەک وەکو ئەوەی کە ئەو ژنە مافی خۆیەتی هەموو مافێکی هەبێت ئەگەر پێشتریش نەیبووە لە بچووکی و نامەعریفی ئەوانە بووە کە ڕێگری بوون، ئەمەشیان هەمیشە پیاوە ڕێگرە لەبەردەم ژندا ئیتر چ باوک بێت یان برا و هاوسەر و... هتد.

١٧- ژمارەیەکی ڕۆشنبیری لاواز لە پیاوان کاتێک هاوکارییەکی ژنەکانیان دەکەن لە ماڵەوە وەکو ئەوە سەیری دەکەن کە کارێکی ئێجگار گەورەی کردبێت و دیسان دەیکەنە منەت بەسەر ژنەکانیانەوە کە ئەو کاری بۆ ئەوی ژن کردووە ئەمەش قوربانییەکی گەورەیە چونکە کاری ئەمی پیاو نییە، بەڵام ئەم لەپێناویدا ئەوا ئەو کارەشی کرد وا دەکات یەک کارەکە لای ژنەکەی هیچ واتا و ڕێزێکی نەمێنێت، لەوەش گەورەتر وا دەکات ژنەکەی وا هەست بکات خۆی لە بیابانێکدا بەتەنیا دەژی و ئەو کەسەی کە ناوی ناوە هاوسەری ژیانی خۆی بەهاوبەشی هەموو شتێکی نازانێت.

١٨- هەندێ لە پیاوان متمانەی ئابووری بەژنەکانیان ناکەن یەک هەمیشە خەریکی حساب و ئامارکردنن چەندی سەرف کردووە وە بەچی داوە، وەکو ئەوەی ئەو مافەی نەبێت. دوو: ژنەکانیان ئاگایان لەلایەنی ئابووریی ئەو نییە بۆی ئاشکرا ناکات و تەنانەت ئامادەیە پارە لای خوشک و برا و کەسوکار حەشار بدات بۆ ئەوەی ژنەکەی بەتەواوی نەزانێت چەندی هەیە، نەخێر لەمەش زیاتر لە دادگاکاندا زۆرجار دوو برا کێشەیان هەبووە لەسەر ئەوەی هەمیشە پارەی پەلکێش کردووە بۆ براکەی گوایە قەرزارێتی، بەڵام کاتێک کێشەیەکیان هەبووە دەستەکەی ئاشکرا بووە کە قەرز نەبووە حەشاردان بووە لای ئەو براکەی لە خێزانەکەی متمانە پێ



کراوتر بووە، ئەم مێژووە ڕەشانە لای ژنان بەچی تۆمار دەکرێت جگە لە خیانەت هەتا بیری بۆ خیانەت نەچێت؟

١٩- هەندێک لە پیاوان خۆیان ڕوو لە سەرجەم شوێنە خۆشەکان و گەشتوگوزار و سەفەر و باڕ و سەماخانە و کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ هاوڕێکانیان دەکەن، بەبێ ئەوەی بەشداری ژنەکەی بکات، واتە ژنەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێت، یان هەمان ماف بەژنەکەی بدات کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا، تەنانەت هەندێ جار ژنێک بچێت هاوڕێیەکی ژنی ببینێت یان پیاوەکە لەگەڵیدا دەڕوات یان کاتی مانەوەکەی بۆ دەستنیشان دەکات، یان کە هاتەوە پرسیاری هەموو گفتوگۆکانیان دەکات، پیاوانێک بەو هەموو هەست بەکەمی کردنەوە بژین، چۆن باوەڕ دەکەن سۆزی ژنەکەیان تەنیا لەگەڵ ئەواندایە؟

٢٠- هەندێک لە پیاوان ڕووی خۆش بە ژنەکانیان نادەن و پێیان وایە ئەو کاتە ژنەکەی وەکو مرۆڤێکی خاوەن کەسایەتی و پیاو سەیری دەکات کە قەپۆز پڕ و کەم قسە و دوو بێت، هەتا لە دەرئەنجامدا وشکی ئەو بەرەو لای زمان تەرێک ڕای دەکێشێت.

٢١- کۆمەڵێکی تر پیاوان زۆر مافی کرداری جوان لە ژنەکانیان تاپۆ دەکەن و دەڵێن با فێر نەبێت و پێیان وایە ئەگەر هاتنە خوارەوەیەک لە پەیژەی غرووری ڕووی دا ئیتر ئەو پەیژە دەشکێت و ژنەکەشی پێی فێر دەبێت کە هەمیشە لە غروور بیهێنێتە خوارەوە لە کاتێکدا هەر هەبوونی ئەو غرووورە خۆ خەڵەتێنە شاهیدی دۆڕاوی ئەون، هەر ئەوەش وا دەکات ژنەکەی بیر لە کەسێک بکاتەوە کە بەساکاری و خۆڕسکی ژیانی لێ وەرگرێت نەک بەو عەقڵییەتە دواکەوتووەی ژنەکەی لە بەختەوەری بکەیت بڵێیت با فێر نەبێت.

٢٢- جۆرێکی تر پیاوان ڕێگەی پێگەیشتن و پێشکەوتن لە ژنان دەگرن، نەک هەر ئەوە بگرە دەست وەردەدەن لە هەموو خواستێکیان و

تەنانەت پۆشاکیش پێویستە بەئارەزووی ئەوان بپۆشن نەک خۆیان.

**٢٣-** هەندێک لە ژنان بەئارەزووری خۆیان شوو ناکەن و بەشێوەی زۆرەملێ و جەختکردن هاوسەرەکەی هەڵدەبژێرێت، بێ گومان هەرگیز دڵی لەگەڵیدا نابێت.

**٢٤-** هەندێک لە پیاوان بەخاتری ڕوخسار یان بەرژەوەندیی مادی و مەعنەوی یان لەبەرئەوەی خوشک و کچی فلان و فیسارە کە کەسوکاریان ناویان هەیە لەناو کۆمەڵدا ژنەکەی خواستووە، ئاشکرایە ئەو ڕوخسار و شێوەیە جگە لەوەی گیانی مردنە بەماوەیەکی کەمیش لە چاویدا کۆن دەبێت، بەدوای وێنەی نوێدا دەگەڕێت.

**٢٥-** هەندێ لە پیاوان لە کاتی گفتوگۆ لەسەر کێشەیەک هێندە چلێسانە پەلاماری مەسەلەکە دەدەن و هەرچی لایەنە سلبییەکانی نێوانیان هەیە دەیدەنە پاڵ ژنەکە، کە ئیتر ساردبێتەوە لە هەموو هەوڵێک بۆ چارەسەرکردن و ئاساییکردنەوەی پێوەندییەکەیان، بۆیە باشترین چارە لەلای دەبێت بەڕاکردن بۆ جیهانێکی تر کە درۆ و تۆمەت و تاوانبارکردنی مێردەکەی بیرباتەوە و گوێ لێ بگرێت.

**٢٦-** پیشەیەکی تر پیاوان کە پاڵنەرێکی زۆر ئاکتیڤە لە خیانەتکردنی ژندا جنێودان و سووکایەتیی پیاوە، سەیرە پیاوێک بەژنەکەی بڵێت بێ ڕەوشت یان سۆزانی یان خراپەکار و هەر وشەیەکی تر چاوەڕوانیی ئەوە نەکات ژنەکەی بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەوەی کە بڵێت خۆ هاوسەرەکەم هەر پێم دەڵێ ڕەوشت نزم و خراپەکار ئیتر بۆچی خراپەکار نەبم پیشانی نەدەم خراپەکاری یانی چی؟

**٢٧-** پیاوانێک هەن هەر لە سەرەتای ژیانەوە کۆمەڵێ کردەوەی نابەجێ و توندوتیژ لە مامەڵە و حساب نەکردن بۆ خواست و بۆچوونی ژن پراکتیک دەکەن، گوایە دەیانەوێ قسەی دوای و بڕیاری دوایی لای ئەوان بێت و خۆیان ئیدارەی ماڵ و ژیانی هەردوولا بکات یان دەسەڵاتی یەکەمی ماڵ



بێت، بەوەش هەر لە سەرەتاوە پەردەیەکی ئەستوور لەنێوان هەردوولادا دروست دەکات کە نەک تەنیا ئیدارەکردنی ماڵەوە بگرە لابردنی ئەو پەردەیەش زۆر زەحمەت بێت، ئەمەش وا دەکات ژن لەگەڵ مێردیدا هەست بەغەریبی بکات، پەنا بۆ ئاشنا بەرێت.

**٢٨-** جۆرێکی تر پیاوان تەنیا ژن و مێردایەتییان لەگەڵ ژندا هەیە و هاوڕێیەتیی لەگەڵدا دروست ناکەن و باسی کەموکوڕی و هەڵەکانی خۆیان لای ژن ناکەن، بەتایبەت لای ژنی خۆیان هەرگیز فرمێسک ناڕێژن، بەڵام ئامادەن لەسەر کۆشی خۆفرۆشێک هەرچی دانپیادانیان هەیە وەکو بەردەمی کەنیسە بەتاڵ بکاتەوە، نازانێت کە ژن دەزانێت مرۆڤی بێ هاوڕێ نابێت، گەر لەگەڵ ئەو هاوڕێ نییە واتە هاوڕێیەکی لە دەرەوەی ئەو هەیە و ئەمی ژنیش هەمان کار دووبارە دەکاتەوە.

**٢٩-** ژمارەیەکی زۆر پیاوان لە ڕوانگەی عەشایەری و پێوەندیی نێوان ئاغا و دەرەبەگ لە دەست ماچکردن دەنوارن، بەکەمی و هاتنە خوارەوەی دەزانن گەر دەستی ژنیان ماچ بکەن، لە کاتێکدا بەپێوەری خۆشەویستی ماچکردنی پشتی دەست واتە ڕێ زلێ گرتن و ماچکردنی ناو لەپ واتە من موڵکی تۆم یان بۆ تۆم، ئەگەر پیاوێک بە وشە و بەهێما ژنەکەی تێ نەگەیەنێت کە بۆ ئەوە چۆن دەیەوێت ژنەکەی تەنیا بۆ خۆی بێت.

**٣٠-** پیاوانێکی تر هەمیشە منەتی کارکردنی خۆیان بەسەر ژنەکانیان دەکەن و وای بۆ دەدەخات مادەم ئەو کار دەکات و پارە دەهێنێتەوە، ئەمی ژن پێویستە خزمەتی بکات و مافی تری لەسەر نییە، یان نازکردنی توانایەک کە هەبێت، پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، کەم نین ژمارەی ئەو ژنانەی خاوەنی تایبەتمەندی و توانان پیاوەکانیان هەمیشە هەوڵ دەدەن لە بەهایان لای خۆیان بهێننە خوارەوە بەکەم سەیری تواناکەیان بکەن و ئیرەییان پێ دەبەن و ڕێگریانن. هەموو ئەوانەی سەرەوە واتای خۆشەویستی و سێکس دەکات لای ژن، سەرجەمیان ئەو خاڵە گرینگانەن کە کاریگەریی ڕاستەوخۆ لەسەر ڕۆح و ژیانی ڕۆحی ژن دەکەن، کێ دەڵێ

ژن تەنیا بەسێکسکردن ڕازی دەبێت هەتا پیاوان ئەگەر لەگەڵ ژنەکانیان ئەنجامیان دا ئیتر لەوە دڵنیابن کەموکوڕییان نییە بەرامبەر ژنەکانیان و ژنەکانیان گەیاندووە بەچێژ وەرگرتن و ڕووبەڕووی دژواری نابێتەوە، ڕێژەیەکی زۆری پیاوان ئەگەر سەیری ئەوە بکات ویستم هەڵەکانی تەنیا لە ١٢ خالّدا چڕ بکەمەوە و گەشتم بە ٣٠ بیرم هاتەوە ١٢م گوتووە و هێشتا زۆریش ماوە پێویستە بزانێت کە ڕۆشنبیریی هاوبەش چەند لاوازە و چەندی کەموکوڕیی تێدایە... چەندین نموونەی تریش کە لەوانە قێزەونترن جا لە هەموو پیاوێک کە ئەو خاڵانە و چەندین خاڵی تر فرامۆشکراویش دەبینێت بەخۆیدا بچێتەوە، بزانێت چەندی لەم خاڵانە تێدایە. ئەوجا دزانێت بۆچی ژنەکەی هەمیشە پەستە و و گەشییەکانی پەڕیوە؟ یان بۆچی خیانەتی لێ کردووە؟ زانستی دەروونی سەلماندوویەتی ئەو ژنانەی هۆکارێک لە ژیانی سۆزدارییاندا هەیە کە دەبێت بەهۆی ناڕەزایی بەتایبەت ئەو خاڵانەی سەرەوە هەمیشە پەست و تووڕە و خەمبار و ڕەنگ زەردە (لەمەوەیە بەژنی ڕەونەقدار دەگوترێ بەختەوەر)، هەتا وای لێ دێت تووشی گرفتی دەروونیی دەکات بەوەش سەرجەم میکانیزمی پەروەردەکردنی لا دەشێوێت و منداڵانێکی توندوتیژ و دواکەوتوو و گرێدار پەروەردە دەکەن وەکو ئەو هەموو نموونانەی لە کوردستان هەن، یان دەرئەنجانی ئەو پاڵەپەستۆ دەروونییە بەرەو خیانەتی هاوسەرێتیی دەبەن چەندە بەهێزیش بێت، چونکە فاکتەرە دەروونییەکان کاریگەرییان لە فاکتەرە عەقڵییەکان لەسەر مرۆڤ زۆرترە... بۆیە پێویستە بەرلەوەی بڵێین ئەم دیاردانە زۆرن و لەناو کوردیشدا تەشەنەیان کردووە پیاوان شۆڕشێکی ڕۆشنبیریی خێزانی لەناو خۆیاندا دروست بکەن هێندەی ئاگایان لە زانستە دەروونی و خێزانییەکان بێت، هەریەک لەو خاڵانەی من باسم کردووە لەبەرئەوەی لە زانستی دروونیدا هاتوون دەکرێت سەدان کەس بەر لە من ڕیزی کردبن و هەزارانیش دوای من بەهەمان شێوە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەیەکی ئێجگار زۆری پیاوان کەڵکیان لێ وەرنەگرتووە و نەبووە



بەبنەمایەکی زانستی بۆ ژیانیان، بۆیە ئەو پیاوانەی کاتێک ژنەکەیان بەر تۆمەتی خیانەتی هاوسەری دەدەن، زیاتر لە مەوداکانی عەقڵی خۆیان شەرمەزار بن و بزانن کە پیاوەتی و بیر و هۆش ڕۆشنبیری خۆیان چەند لا کەم و ئاست نزمە کە پاڵی بەژنەکەیەوە ناوە خیانەت بکات، ئەو پیاوانەی بەتاوانی شەرەف ژنەکانیان دەکوژن یان هانی برا و کەسوکاری لێ دەدات کە کچ یان خوشکەکەیان بکوژن گوایە شەرەفی ڕۆیشتووە، جوانترە شەرەفی خۆی نەبات هەموو کەس لەوە ئاگادار نەکات کە ئەو هەموو کەموکوڕییەی مۆراڵی و ڕۆشنبیری و کرداری مرۆڤانە و شەرەفی تێدایە کە پاڵی بەخوشکەکەی، کچەکەیەوە ناوە لە سروشتی ڕابردووی خۆی دەرچێت بەرەو سروشتێکی نارێکی جیاواز. کام پیاو بەتایبەت پیاوی کورد کە چوار مێخەی عەقڵی بەوشەی شەرەف دراوە ڕاڤەی ئەوەی کرد، ژنەکەی پێشتر و بەرلەوەی ببێت بەهاوسەری ئەو نەخۆفرۆش بووە و نەخیانەتکار پاش هاوسەرکردنی ئەو شەرەفە چییە لە ئەوی پیاوی وەرگرتووە تا ببێت بەخۆفرۆش و خیانەتکار، ئایا ئەگەر خۆفرۆش بوایە ئەو دەیکرد بەهاوسەر؟ بێگومان نەخێر... کەواتە بەر لە ناسینی ئەو خۆفرۆش و خیانەتکار نەبووە. گەورەترین شەرمەزاری بەنێوچەوانی زۆرێک لە پیاوانەوە بەتایبەت پیاوانی کوردیش کە ئەم مەسەلەیە بووە بەدیاردە لەناو کوردستاندا ئەوەیە هێندە ناتەواون لە هەموو ڕووەکانەوە بوون بەهۆی ئەوەی ئەو هەموو خۆفرۆشی و خیانەتە بڵاوبێتەوە لە کاتێکدا هیچ ژنێک لە دنیادا بێ ڕەوشت نییە وەکو ئەوەی پیاوان بانگەشە دەکەن بۆ هۆکاری خیانەتەکان بگرە هەمیشە پیاوێکی گەمژە و کاڵفام لەپشت ئەو کردەوەیە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێویستە ژن بگات بەئیرادەیەکی لەوە بەهێزتر، دەروونێکی لە دەروونی ئەو جۆرە پیاوە ساغتر، یەکەم هەوڵ بدات بۆ چارەسەری کێشەکە و ئەگەر زانی هاوسەرەکەی لەو جۆری خاڵی (٢٥ و ٢٦)ە ئەوا سڵ لە تەڵاق وەرگرتن نەکاتەوە چونکە هەموو کاتێک تەڵاق وەرگرتن لە خیانەتی هاوسەری پەسەندترە، هەندێ جار دەگەم

بەقەناعەتێک کە هەموو ژنێکی کورد پێویستی بەدوو جار شووکردن هەیە، جارێک بۆ تەڵاق و جارێک بۆ هاوسەری، مرۆڤ ئەو بێ ئومێدییەی لەوەوە تووش دەبێت کە ژنی ئێمە هێندە لە پیاوە دوورە تەنیا بەهاوسەرێتی دەتوانێت هێندە پیاوێک ببینێت کە بتوانێت بزانێت هەڵە و ڕاستەکان و درۆ و ساختەکانی پیاو لە کوێدا بەرجەستە دەبێت، چونکە ژنی کورد چ لەڕووی خوێندەواری و چ لەڕووی کولتوورییەوە هێندە دابڕاوە کە زۆرجار ئاگاداری فاکتەرەکانی چەوساندنەوەی خۆشی نییە، تەنانەت نازانێت ڕەنگزەردی و تووڕەیی و ناڕەزاییی هەمیشەیی لەو فاکتەرانەی سەرەوە سەرچاوەی گرتووە. دیسان پیاوی کورد هێندە ناڕۆشنبیرە کەمیان هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی هەڵدەبژێرن ١٠٠٪ ڕاستگۆ بن، بۆ ئەوەی لەپاشدا ناڕاستییەکانی تووشی گرفتی نەکات و ژن بەر لە هاوسەربوون بەڕاستی و وەکو خۆی بیناسێت، چونکە پێی وایە ئەوی پیاو پێویستی بەعەقڵێکی لە کار کەوتووە، با ئێستا عەقڵی لە خشتەبەرێت پاش هاوسەری ناچارە هەموو شت پەسەند بکات، نازانێت ئەو عەقڵە لە کار کەوتووە بەرەو ڕێگەی تری دەبات.

## ئایا فیمینزم باوەڕی بەئازادیی سێکسی هەیە؟

بەبێ ئەوەی بچمە سەر هیچ پێشەکی و سەرچاوەیەک ڕاستەوخۆ دەڵێم ئەوانەی لە سەرەوە باس کران و ئەوانە کە هەر پرۆسەیەکی دەرەوەی سروشتی مرۆڤایەتی هیچ مافێکی بەسەر فیمینزمەوە نییە، مرۆڤی فیمینست هەڵگری ئەو جۆرە ئاکارە نییە، ناڵێم بیروباوەڕ چونکە لە بنەمادا هیچ پابەندییەکیان لەگەڵ فیکردا نییە و تەنیا هاوبەشیی دەرد و گرێ دەروونییە جیاوازەکانن و دیارترین هۆکارەکانی ئەو پاڵنەرە دەروونیانیەشمان دیاری کرد. لە بنەمادا هەوڵی فیمینست پێویستە دەرچوون بێت لەبندەستی و چەوساندنەوە جیاوازەکان تەنانەت لە جۆری چەوساندنەوەی خود بۆ خودیش، من ئەمە دەکەم بەپەیامی نوێ فیمینستی



کوردی و پێویستە ئەوە بزانرێت کە دیاردەی لیزبێنیش (سێکسکردنی هاوڕەگەز، واتە ژن لەگەڵ ژندا بەهەمان هەڵە و پاڵنەری دەروونی لای مرۆڤەکانە سەری هەڵداوە و جرێک لە چەوساندنەوە و تۆڵەکردنەوە لە خود، بەڵام تەنانەت لە ئەوروپاشدا هەندێ سەرلێشێواو ئەو پرۆسەیە ئەنجام دەدەن گوایە فیمینستییە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە و بەلێکدانەوەی ساکاری هەر مرۆڤێکی ساکاریش دوور لە هەموو بەهایەکی ڕۆشنبیری گەر بگوترێ چمکێک خۆی دەنوێنی بۆ گۆڕینی ژیانی ژن لە گوتاری پارتیارکییەوە بۆ گوتاری ژنانە، تێ دەگات کە مەبەستی هەڵاواردن و لابردنی سەرجەم چەوساندنەوەکانە لەسەر ژن، ژنیش هەتا هۆشیار نەبێت نازانێت جۆری چەوساندنەوەکان چۆنن بۆ ئەوەی قەڵاچۆیان بکات، کە بوو بەخاوەنی ئەو لێکدانەوەیەش ئەو کات دەزانێت تەنانەت بیر ڕۆیشتنی خۆشی بەلای مەسەلەیەکی وەکو لیزبێندا تاوان و چەوساندنەوەیەکی نوێیە، ئەم جۆرەیان نە کۆمەڵ پاڵنەریەتی نە کولتووری کۆمەڵایەتی بەڕێژەی زۆر، بگرە بەباوەڕی من ڕێژەی ٩٠٪ بیری نادروست و کارکەرە دەروونییەکان پاڵنەری ئەو مەسەلەیەن، وە ئەگەر لە من بپرسیت ئەو جۆرە مرۆڤانەی سێکسی هاوڕەگەز ئەنجام دەدەن چییانە! ڕاستەوخۆ دەڵێم نەخۆشیی دەروونییان هەیە.

بۆ زیاتر جەختکردن لەسەر ئەوەی کە فیمینست واتە ئازادیی سێکسی و خۆفرۆشی و خیانەتی هاوسەری ناکات، دەچمەوە سەر بەشێک لە ژیانی گەورە دانەری تیۆری فیمینستی، سیمۆن دی بۆڤوار ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٤٧ دەچێت بۆ وانە گوتنەوە لە زانکۆکانی ئەمەریکادا، ئەو کاتە بۆڤوار تەمەنی ٣٥ ساڵ بوو و لە لووتکەی ناوبانگدا بوو کە لە پاریسەوە ڕووی کردە ئەمەریکا و لە شیکاگۆ بوو بەهاوڕێی نووسەری بەناوبانگی ئەمەریکی (نلسۆن گرنیە)ی خاوەنی ڕۆمانی (ئەو پیاوەی دوو باڵی ئاڵتوونینی هەبوو)، هەو لەوێ لەگەڵ بۆڤواردا پێوەندیی خۆشەویستی دەکەوێتە نێوانیان و هەتا ساڵی ١٩٦٤ نامەیان گۆڕیوەتەوە، بەڵام پاشان

سیمۆن بەژنهێنانی نلسۆن گرنیە لە ژنێکی تر تووشی شۆک دەبێت، بەتایبەت کە خۆشەویستیی بۆڤوار بۆ گرنیە خۆشەویستیی کاتی و ناڕاست نەبووە، بۆیە بۆڤوار دەگەڕێتەوە پاریس لەوێ لە دووتۆی کتێبێکدا بەناوی (پیاوە خۆشەویستەکەی شیکاگۆ، نامەکان بۆ نیلسۆن گرنیە) سەرجەم ئەو نامانەی بڵاوکردەوە کە بۆ گرنیەی نووسیوە، ئیتر لەو کاتەوە پێوەندیی خۆشەویستی لە ژیانی بۆڤواردا سڕایەوە وەکو ئەوەی خۆی باسی لێ کردووە و نزیکترین پیاویش لێوەی سارتری هاوڕێی بوو کە خاوەنی درێژخایەنترین هاوڕێتی نێوان نووسەران و بلیمەتانن، ئەم هاوڕێیەتییەیان ٥٢ ساڵی خایاند بەبێ ئەوەی هاوسەری بکەن، بەڵام لە هەموو ئەمانە گرینگتر ماوەی ئەو ٥٢ ساڵە هاوڕێیەتییە و هەموو تەمەنی بۆڤواریش هەتا مردنی ئەو ئەنگوستیلەی نیلسۆن گرنیە پێی بەخشی بوو هەر لە پەنجەیدا بوو.

مرۆڤ گەر لەو هەڵوێستە بڕوانێت کە بۆڤوارێکی یاخی لە سەرجەم بۆچوونەکانی سەردەمی خۆی و گەورە داهێنەری فەلسەفەی بوونگەرایی لەگەڵ سارتری هاوڕێی و گەورەترین نووسەری سەردەمی خۆی بەرامبەر مرۆڤێک کە خیانەتیشی لێ کردووە، دەزانێت ئەم خۆشەویستییەی بۆڤوار زۆر لەوانەی خێڵی عەزرە مەزنتر و پاکترە، چونکە دەکرێ پاڵەوانانی خێڵی عەزرە خۆشەویستییان کردبێت تەنیا بەهەبوونی سۆز بەڵام بۆڤوار بەهەبوونی سۆز و ئاوەز و هزر، ئەگەر ئەوانەی یەکەم تەنیا داستان و چیرۆکی خەیاڵی بن، ئەوا دووەمیان کە بۆڤوارە کەسێکی ڕاستەقینە و دانەری تیۆریی ژیانە، کەواتە لای فیمینزم خۆشەویستی ئەو پیرۆزی و واتایەی هەیە کە بەرامبەر ناکرێت لەگەڵ واتاکانی ئازادیی سێکسی و لەشفرۆشی و خیانەتدا. ئایا بۆ کەسێکی وەکو سیمۆن دی بۆڤوار لە کۆمەڵگایەکدا نەبوو ئازادانە ڕێگە جۆر بەجۆرەکان بخاتە بەردەمی؟ ئایە هزر و بۆچوونی ڕێگەی پێ نەدەدا کە ئەو کارەساتە بەئاسایی وەربگرێت؟

نەیدەتوانی بیر لە تۆڵە بکاتەوە و گورزی کوشندە لە گرنیە بدات لە بری ئەوەی ڕاستگۆیانە ئەو بەڵگانە بڵاوبکاتەوە کە لە هەموویاندا باسی



خۆشەویستیی خۆی بۆ گرنیە دەکات، هەروەها لەپاشاندا باسی وەفا و پابەندبوونی هاوڕێیانەی بەسارتەرەوە دەکات، هەر ئەم خۆشەویستییەش پێوەندیی زۆری بەنووسینی کتێبی (ڕەگەزەکەی تر) کە بەرجەستەی خۆشەویستی وا دەکات گەورەترین داو بێت بۆ ژن، کەواتە سیمۆن لە ژێر کاریگەرییەکی زۆری ئەو پێوەندییە خۆشەویستییەدا بووە. لێرەوە دەتوانم بڵێم ئەو بۆچوونانەش کە لەسەر سیمۆن دەگوترێت گوایە لێزبێن بووە، واتە پرۆسەی سێکسیی لەگەڵ قوتابییە کچەکانی خۆیدا هەبووە کە من ناتوانم ئەمە بەتەواو وەربگرم چونکە سەرچاوەیەکم لەبەردەستدا نییە ئەو مەسەلەیە ڕاست بکاتەوە دیسان ئەو ژنە وەکو خەباتکارێکی یاخیی سەردەمی خۆی دەکرێت زۆر ناحەزی هەبووبێت و، ئەوانەی گوتراوە تەنیا بۆ لێدانی بووبێت بەتایبەت لەو کاتەدا کە تازە بزووتنەوەی لیزبێنی بەئاشکرا و بەهێزەوە دەردەکەوێت و لای ڕۆژئاواییەکانیش بەپرۆسەیەکی نەفرەت لێکراو ناوزەد کراوە.

بەڵام لە هەمان کاتدا ئەگەر ئەو مەسەلەیە ڕاستیش بێت، سیمۆن کاتێک ئەوەی نەکردووە کە خۆی قوتابی بووە، بگرە کاتێک بووە کە قوتابیی هەبووە واتە مامۆستا بووە، لەو کاتەشدا تووشی شۆک بووە بەرامبەر بەمرۆڤێک کە بەڕاستی خۆشی ویستووە و ساڵانێکی تەمەنی لەبەر خاتری ئەو لە ئەمەریکادا بەسەر بردووە و، کەوتووەتە ژێر ئەو کاریگەرییە گەورەیەش کە گەورەترین شاکار بنووسێت، ئەڵقەکەی تا مردن لە پەنجەدا بێت و نامەکان بڵاوبکاتەوە، کارێکی ئاساییە کەوتبێتە ژێر کاریگەریی ئەوەی کە متمانە و خۆشەویستیی بۆ پیاو نەمێنێت و بەرەو لادان بچێت چونکە وەکو گوتمان ڕاستە ئاستە فیکرییەکان کاریگەریی گەورەیان لەسەر کاریگەرییە دەروونییەکان و هێزی ئیرادە هەیە، بەڵام لە هەمان کاتدا پاڵنەرە دەروونییەکان کاریگەرییەکی ئێجگار گەورەتریان هەیە. بۆیە بۆڤواریش وەکو هەر ژنێکی تر دەکرێ کەوتبێتە ژێر ئەو کاریگەرییە دەروونییانەی کە پێشتر بەچەندین خاڵ باسمان لێوە کرد،

چونکە لە ژیانی بۆڤوار و ئەو کاروانی خۆشەویستییەدا کە ماوەیەکی درێژی خایاندووە کۆمەڵێک لەو خاڵانە ئامادەییی خۆی دەنوێنێت. بەڵام هەرگیز ئەوە واتای فیمینستێت ناکات و بۆڤوار لە هیچ سەرچاوەیەکدا ئاماژەی بەوە نەکردووە و تەنانەت ئەگەر ئەو مەسەلەیە ڕاست بێت و بۆڤوار کەسێکی لیزبێنیش بووبێت لە هیچ سەرچاوەیەکم نەبینیوە ئاماژەی پێ بکات و شانازیی پێوە بکات، یان دانی پێ دابنێت کە بەڕاشکاوانە باسی لە قۆناغەکانی ژیانی کردووە. خۆ گەر بۆڤوار نەیزانیبایە بۆچوون و کردەیەکی هەڵەیە گوزارشتی لێ دەکرد، یان گەر بیزانیایە لەنێو چوارچێوەیەکی فیکریی دیاریکراودا بەتایبەت فیکرێکی وەکو فیمینستی جێگای دەبێتەوە بێگومان ڕاڤەی دەکرد چونکە شتێک بوو خۆی کردوویەتی دەبوو بڕواشی پێی هەبێت.

ژنی کورد پێویستە ئەوە بزانێت تەنانەت ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان فیمینزم بوون واتای لیزبێنی و ئازادیی سێکسیشی کردبێت، ئەو هەر پێویستی بەسیستەمێکی فیمینستییە بەو واتای جیهانبینیی ژن، نەک بەواتای جێگەکردنەوەی ئەو نەریتە یان دەرد و گرێ دەروونییانە، بگرە تیۆرییەک لەسەر بنەمای دروستی دەروونی و زانستی و پسپۆڕی لە جیهانبینی ژندا دامەزرابێت و باوەڕی مرۆڤیش بەرەو کایەی مەعریفیی ئەو پرۆسەیەی بەئاسانی تێیدا بەرجەستە بێت، باوەڕی بەوە هەبێت کە دینامیکییەتی دەرەوە کاریگەریی هەیە لەسەر پێوەندیی کردار و پەرچەکرداردا، لەوێشەوە مرۆڤ مل دەنێت بەرەو دۆخێکی نوێ کە دەکرێ پۆزەتیڤ بێت یان نێگەتیڤ، پێچەوانەی مانای ئەوە دەگەیەنێت کە کەسی گرفتار یەکەیەکی نییە بۆ سەنترالیزمبوونی خود، بەهۆی بەکارهێنانی عەقڵی لە کار کەوتوو.

## لە کار کەوتنی عەقڵی بەکار نەهێنراو

ژن ئەو مرۆڤە ساویلکە نییە هەست بەچەوساندنەوەی خۆی نەکات، هەوڵی ڕزگاربوونیش دەدات، بەڵگەش ئەوەیە ژنێکی لادێ نشینی



نەخوێندەوار کە لە چەوساندنەوەکانی خۆی یاخی دەبێت مێردەکەی بەجێ دەهێڵێت و ڕوو دەکاتە ماڵی باوکی، کە ئەوە تەنیا ڕێگەچارەی ئەوە، لە ماڵی باوکیشدا هەر چەوساوەیە، تەنانەت ئەو ژنانەی کە بەپێی ئاستی ڕۆشنبیریی خۆیان بۆ لای دوعاکەر و جادووگەرەکان دەچن دیسان لەپێناوی ڕزگاربوون و کۆتایی هاتن بەچەوساندنەوە دەڕۆنە ئەو جێگایانە لە وەهمیدا بۆ چارسەر دەگەڕێن، هەتا ئەو ژنانەی لە هاوسەرە چەوسێنەرانەکەیان جیا دەبنەوە و... هتد، بەڵام هۆشیاری نەگەیشتووە بەئاستێک بزانێ کەموکوڕییەکان لە کوێدایە، ئەو کەم زانین و ناڕۆشنبیرییەشی زادەی سروشتی خۆی نییە و بەتەنیا زادەی فەرهەنگ و کولتووری پەروەردگار و ئامادەییی نەریتە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووەکانە، چونکە هەردوو ڕەگەز بەهەمان ئامادەییی خۆرسکی، ئاست و شێوە لەڕووی توانا و زیرەکییەوە دێنە دنیاوە، بەڵام ئەو وزە و توانایانە لای منداڵی کوڕ هەر لە منداڵییەوە ئاکتیڤە و بەکاری دەهێنێت و لای مێینەش هەر لە منداڵییەوە دەچەپێنرێت و ڕێگە لە گەشەسەندنی دەگیرێت، لەمەشدا بەتەواوی باوەڕم وایە کە وزە و هزر و عەقڵێک بەکارت نەهێنا زووش لە کار دەکەوێت، چونکە مرۆڤێکی پسپۆڕ چۆن هەتا زیاتر لێکۆڵینەوە بکات دۆزینەوەی زیاتر بەدەست دەهێنێت، قوتابییەک چۆن هەتا زیاتر کۆشش بکات نمرەی زیاتر و توانای زیاتر لە وانەکانیدا بەدەست دەهێنێت هزر و ئاوەزی مرۆڤیش بەهەمان شێوەیە، هەتا مرۆڤ ڕاڤە و تێبینیی زیاتری هەبێت بەرامبەر دەرکەوتەکان زیاتر هزر و ئاوەزی گەشە دەکات، هەتا هەمان پرۆسە کەمتر بێت ئاستی ئاوەز و هزریش بەرەو پووکانەوە و فەوتانی تەواو دەچێت، ئەگەر سەیری ئەو بەشەی ژیانی ژن بکەین کە هەر لە منداڵییەوە ئاکتیڤ دەکرێت لە هزریدا و ڕێگە بەگەشەکردنی دەدرێت بەشی شووکردن و منداڵ بەخێوکردن و ماڵدارییە بەکۆمەڵێک گرێی دەروونی و ترس و تۆقینەوە، هەر ئەم فاکتەرانە وا دەکەن ژن زیاتر بەلای نەزانی و شەرمنی و کەم هزریدا ئاقار بگرێت کە (ژنی شەرمن شارێک

دەهێنێت) لای نەتەوە دواکەوتووەکانی وەکو کورد، بەبێ هزر و ئاوەزیش شارێکی هێنا هێندەی تر دەچێتە ژێر کاریگەریی ساویلکەیی و ترس لەوەی ژنێکی تر لەو شەرمنتر و بێ ئاوەزتر هەبێت و گرەوی شارەکەی لێ بباتەوە، ئاشکرایە ئەو کاتەی ترس و شەرم و بێ ئاوەزیش ئامادەییی دەبێت بەرگری نامێنێت، بەم شێوەیە ژن لە بازنەیەکی بەتاڵدا دەخولێتەوە تا دەگات بەو ئاستەی کە جەستەی خۆی پەروەردە بکات لەپێناوی ڕازیکردنی پیاوێکدا لە چوارچێوەی تەنیا یەک ئامانجدا ئەویش ژیانە، ژیانێک بێ هزر و تێ فکرین و ڕا و پایەگە تێدا، ئەمی هەمیشە ڕازی بەهەموو شتێک و بێ ڕا و بێدەنگ ئەو جەستەیە پێشکەش بەو پیاوە دەکات کە دەیژێنێت و ناوی ناوە هاوسەر یان هاوبەش ئەوی هاوسەریش دەچێت کار دەکات لەپێناوی ئەو جەستەدا پارەی بۆ دەهێنێتەوە، چونکە کاتێک پێوەندیی ڕۆح، فیکر و ڕا نامێنێ، تەنیا پێوەندیی لەش دەمێنێتەوە بەبێ بەها مرۆییەکان، لێرەوەیە جەستەیەکی سێکسئامێز دەتوانێت گارەنتیی زیاتری مانەوەی ژیانی بدات، ئەگەر مرۆڤ بەویژدان و بەوردی سەیری ئەو پرۆسە بێ ڕۆحەش بکات دیسان لە پرۆسەی لەشفرۆشی دەچێت، بەڵام لەشفرۆشییەکی لەژێر پەردەی هاوسەرێتیدا شەرعییەتی پێ دراوە، ئەو پرۆسەیەش لای هەردوو لا دەچێتە خانەی داگیرکاری و دەست بەسەراگرتن ئەمەش هەڵەی تێگەیشتنی پیاوە لە ژن، کە پێی وایە مادام جەستەی هەیە بۆ سێکس و گەڕایەوە ماڵەکەی پاکە و نانیش ئامادەیە بیخوات ئیتر مانای ئەوەیە کە هەست و سۆزی ئەو ژنەی داگیر کردووە و بەتەنیا هەڵگری هەست و سۆزی ئەوە، بەڵام لە ڕاستیدا چەند پیاوان هەڵەن هێندەش ژنان خۆیان چێژ لەو ئاستە ژیانە وەردەگرن، ژیانێکی بێ بەرهەمی دوور لە هەموو چالاکییەکی هزری و ئاوەزی و هۆشمەندی، چونکە لە بنەمادا هزر و هۆشیارییان هەر ئەوەیە کە پراکتیکی دەکەن.

مرۆڤ هەر لە سەرەتاوە دوو هەڵبژاردەی لەبەردەمدایە کە پێی بژی،



یەکێکیان: ژیانە لە ئاستی پێداویستییە سەرەکییەکانی وەکو خواردن و خواردنەوە و سێکسی تێدا سەقامگیر بێت کە لەگەڵ ژیانی ئاژەڵێکدا جیاوازیی نییە و ئاژەڵانیش هەر وا دەژین، دوو: ژیانێک کە لەنێو پێکهاتە هزری و ڕۆحی و مرۆییەکاندا بەردی بناغە هەڵدەکۆڵێت، بەڵام ئەگەر سەیری ژن بکەین یەکەمیان هەڵدەبژێرێت لەپێناوی پاراستنی ئەو هێلانەی کە تێیدا دەژی و مافی هەبوونی خواردن و خواردنەوە و سێکسەکەی دەداتێ. بەڵام غەفڵەتگیریی پیاوان و کەم ئاستیی ئاوەزیان لەوێدا ئاشکرا دەبێت کە زۆرجار ئەم جۆرە ژیانە دەبێت بەهۆی ئەوەی لەناکاودا زللەی واقیع بەر ڕوومەتی ئەو ژنە بکەوێت پەنا بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییییە ڕۆحییەکانی لای پیاوانی تر ببات. هەروەکو لەناو ژیانی کەسانی تاراوگەدا ئێستا زۆر باوە.

ئەو ژنانەی هەر لە سەرەتاوە بەو هێندە بەشە کارایەی ئاوەزیان ژیانیان خوێندووەتەوە کاتێک بەهەر شێوەیەک بێت لە دەستی چەوسێنەرەکەیان دێنە دەرەوە، ئەمانیش دەبن بەچەوسێنەرێکی تر جارێک چەوسێنەری جەستەی خۆیان و جارێک چەوسێنەری ڕەگەزی بەرامبەر، تەنیا ئەگەر هاوپۆلەکەی خۆم بەنموونە وەربگرم ئەوا هەموو هەڵسوکەوتەکانی ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو مرۆڤە زۆربەی خاڵەکان و فاکتەرە هەڵەکانی بەشی پێشووی نێوان ژن و پیاوی لەنێوان خۆی ئەو هاوسەرەی کە لەگەڵ دوو منداڵەکەیدا بەجێ هێشتبوو تاقی کردووەتەوە، واتە ئەو بەعەقڵییەتی لەکارکەوتوو لەگەڵ پیاوێکی غافڵگیر لەوانەی کە تەنیا لە ژیانە ئاژەڵییەکەدا ژن دەبیننەوە، لەناکاودا کە جامی پڕبووە ڕاستەوخۆ بەجێهێشتنی کاردانەوەی هەبووە و وڵات بە وڵات گەڕاوە هەتا بەو دوایە لەم وڵاتەدا نیشتەجێ بووە و، لەبەرئەوەی خاوەنی ئاوەزی ناکارا و باوەڕ بوو بەخۆشەویستی پشت بەستووە بەبەرامبەر. ئەو جۆرە خۆشەویستییەی کە ڕێژەیەکی زۆری ژنانی کورد متمانە دەخەنە سەر ئەو جۆرە خۆشەویستییە، واتە نواندنی خۆشەویستی دەکەن لەبەردەمی پیاوێکدا

لەپێناوی ژیاندا وەکو لەپێشەوە گوتمان لە ئەم پێشکەشکردنی جەستە و لە ئەویش پارە و خزمەت بەجیاوازی هێلێکی باریک لەنێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا، ئەویش یەکەمیان دەبێت بەلەشفرۆشی هەر ڕۆژەی ڕەنگێک، فرەیی، دووەمیان دەبێت بەخۆفرۆشی تایبەت هەروەکو سەرمایەی تایبەت واتە Boy Friend ئەویش لە ڕێگەی مەشروعییەتی هەبوونی پێکەوە ژیانی لەگەڵ هاوڕێی کوڕ دیارە من دژی ئەو پرۆسەیە نیم بەو شێوەیە کە ناوی بنێم لەشفرۆشی ئەگەر بۆی فرێند گرتنەکەی لەسەر بنەمای خۆشەویستی بێت، بەلام کاتێک دەبێت بەبەرژەوەندی گۆڕینەوەی جەسەدی و مادی یەکەم لای ژنەوە و دووەم لای پیاو ئەمانەیان دەبێت بەلەشفرۆشی لەژێر ناوێکی دیدا و، بەهیچ شێوەیەک ئەو بۆچوون و کردانە لەگەڵ بۆچوون و هزری فیمینستیدا یەک ناگرێتەوە و ئەوەی ئەو کردانە دەکات بەبەهانەی هەڵگری ئەو بیروبۆچوونە تەنیا وشەکەی بینیوە و نازانێت واتای چییە، جگە لەوەی هەوڵ دەدات شەرعییەتێک بۆ ئەو کارە بدۆزێتەوە کە خۆی دەزانێت هەڵەیە و بەلام بەسەر خۆی ناهێنێت و هەمیشە لە هەوڵی گەڕاندایە بۆ دۆزینەوەی پاساوێکی سڕکەر.

## مرۆڤ، خود، سەنترالیزمی بوون

لە ڕوانگەی سەنترالیزمیبوونی مرۆڤەوە لە جیهاندا، دەتوانین بڵێین هەندێ مرۆڤ خاوەنی عەقڵی کاران نەک پەککەوتە بەلام ڕووبەڕووی هەمان چارەنووسیش دەبنەوە و، دەتوانین بڵێین سەنتەری جیهان بۆ هەر مرۆڤێک خود (ذات)ی خۆیەتی، چونکە جیهان هێندە ئیدراک و مەزندەی تۆ بۆی بوونی هەیە، کە بێ گومان ئەو ئیدراککردنەش مەرجە مادی و مەعنەوییەکانی تێ دەکەوێت بەشێوەیەک دەتوانین بڵێین جیهان هێندەی دروستیی بینینی تۆ و ساغیی چاوەکانت واتە بەپێی بینینی تۆ بوونی هەیە، کە دەکرێت بینین و جیهانبینیی تۆی مرۆڤ جیهانی جوانتر یان ناشیرینتر بەرجەستە بکات، هەر ئەو بینینەش دەبێت بەهۆی تێڕوانین و



ڕاڤەکردن و بۆچوونەکان سەبارەت بەژیان و جیهان کە سەنترالیزمی تۆی مرۆڤی تێدا دەردەکەوێت. ئەمە سەبارەت بەهەستەوەرەکانی تریش هەر وایە، لێرەوەیە کە ئیدراکی زانایەک لەگەڵ نەزانێک و منداڵێک لەگەڵ گەورەیەک و برسییەک لەگەڵ تێرێک و هەستکردن بەتەواوی پنتە هەستەوەرییەکانی مرۆڤ جیا دەکرێتەوە، هەر بەپێی ئەو تێگەیشتن و ئیدراککردنەش مرۆڤ یاخۆ خودی دەتوانێت سەنترالیزمێکی کارا بێت یان پەککەوتە، ئەو خودەش تەنیا لە بۆشاییدا هەست بەسەنترالیزمی بوونی خۆی ناکات، یاخۆ تەنیا بەتێکەڵاوبوون و ئینتمابوونی بۆ ڕەگەزەکەی تر، بگرە پێویستیی بەئینتمابوون بەدایک و باوک، خزم و دۆست و هاوڕێ و شار و کوچە و کۆڵانەکانی منداڵیش هەیە، پێویستی بەو کۆمەڵەیە کە ئاشنای باوەڕ و یاسا و پرەنسیپە مرۆڤایەتییەکانن، جگە لە ژینگە و کاریگەرییەکانی کە سەرجەم ئەوانە بەشێکن لە کاریگەرییەکان لەسەر یەک خود و جیهان کە جودی ئەو دەبێت بەسەنترالیزمی، هەتا دەگات بەکاریگەریی گۆڕێنەری نێوان مرۆڤ و ئەو ژینگانە، بەشێوەیەک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و کاریگەرییان لەسەر دەبێت و کاریگەریی دەبێت لەسەریان، بەو شێوەیە وەکو یەکەیەکی یەکگرتووی لێ دێ نەتوانرێت بەشێوەی ڕەها جیاوازیی نێوان من (الانا) - من انا - (اللا انا) بکات لێرەوەیە کە من - الانا - لەگەڵ جیهاندا یەک دەگرێت لە میانەی گەیشتن بەو ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ئەو جیهانە مرۆڤ دەتوانێت بگات بەپنتەکانی - من: الانا - و دۆزینەوەی ناوەڕۆک.

کەواتە مرۆڤ پێویستە لە جیهان و لە خودی خۆی و لە سروشت و پشتی سروشت بگات هەروەها پێوەندییەکانی ئەو جیهانانە بەیەکەوە، بۆ دۆزینەوەی ئەو پێوەندییانەش پێویستە مرۆڤ بگات بەپێویستییە بنەمایەکانی متمانەبەخشی بەمانەوە، ئەوانەی لێکۆڵیاری ئەمەریکی ماسلۆ بەخواردن و خواردنەوە و سێکس دایان دەنێت، کە دیارە ئەمیش خۆشەویستیی تەنیا بەسێکس چواندووە... بەلام بەڕای ئێمە سێکس لە

دەرەوەی خۆشەویستی کردەیەکی بەربەرییانە دەبەخشێت، پێم وایە ئەو دڵنیاییانەی کە خۆشەویستیی ڕاست دەیبەخشێت لە پێوەندیی سۆزداریدا هەیە لە دۆخی پێوەندیی بێ خۆشەویستیی سۆزدا نییە. ئەو هەستکردنەش ئەم پێداویستییانە لەگەڵ پێداویستییە سەرەکییەکان یەکسان دەکات. لەوانە:

- هەست بەئەمان کردن.
- هەست بەئینتیما کردن.
- هەست بەدانپێدانان لەلایەن کۆمەڵەوە.
- هەست بەبەهای خودی کردن.
- هەستکردن بەئینتما بۆ جیهانی یۆتۆپی خۆشەویستی.

مرۆڤ هەرگیز ناگات بەچێژی ژیان هەتا ئەو پێداویستییانەی نەهێنێتە دی لە هەمووشیان زیاتر هەستکردن بەئەمان بەدڵنیایی کە ئەمە یەکێکە لە فاکتەرە ئیجابییەکان، پاڵ بەمرۆڤەوە دەنێت بۆ بەرەو پێشچوون، هەروەها مامەڵەکردن لەگەڵ کارەساتەکان وەکو کەسێک کە متمانەی بەخۆی هەیە و هەست بەدڵنەوایی و پتەویی بڕیارەکانی دەکات، چونکە پێناسەی تاک لەناو کۆمەڵدا لەسەر بنەمای متمانە خودییەکانی دەستنیشان دەکرێت. لەوێوە دان پێدانانی کۆمەڵ بۆ ئەو کەسە دەستەبەر دەبێت، پێچەوانەی فاکتەرە نێگەتیڤەکانی وەکو ترس و خەم. (بگەڕێوە بۆ ڕەهەندی چوارەم لای ژنانی ئەنفال... کاریگەریی خەم).

لەنێوان تەوەری یەکەم و دووەم، پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ، یەکەمیان دەتوانێت پێوەندیی یەکسانی وجدانی لەگەڵ بەرامبەردا هەبێت کە دیداری نێوان دوو پێناسە دەکات، خۆ ئەگەر ئەو فاکتەرە ئامادە نەبوو واتە لایەنگری لە یەکێکیان و دەسەڵاتخوازی و وشکی لەگەڵ هەبوونی نواندنێکی ڕووخساری لای یەکێکی دییاندا، کە ئەو پەردەیەش زوو هەڵدەدڕێتەوە، ئەوەش هەرگیز پێکگەیشتنی هەردوو پێناسە ناکات، جگە



لەوەی کۆڵەکەی پێناسەی ئەوی نوێنەر هەڵدەکەنێت، باوەڕی ئەوی تریش لەق دەکات پێناسەی خۆشەویستی لەوێدا پێ دەدۆڕێنێت. پێناسە جیاوازەکانی تر جێگەی دەگرنەوە.

**سەرچاوەکان:**


- المرأة في التراث الاشتراكي... ترجمة: جورج طرابيشي.
- علم النفس في حياتنا... عبدالمنعم الحفني. مدبولي ١٩٩٨ اليومية.
- الأنا والهو... سيجمند فرويد. دار الشروق ١٩٨٨.
- بحوث ودراسات في علم النفس... أمل الأحمد. مؤسسة الرسالة ٢٠٠٢.
- الطب الجنسي النفسي الثقافة الجنسية الصحية ضرورة لابد منها... الدكتور حسان المالح.
- Health - Saudi Now.
- www.anne clerk.com

# بەشی پێنجەم

- ڕەهەندی چوارەمی فیمینزم و تیۆریی خەم لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال.
- تیۆریی خەم.
- خەم و تیۆرییە فیزیکییەکان.
- ڕەهەندی یەکەم: تیۆریی درێژی.
- ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆریی یەکەم.
- زیادەڕۆیی لە کڕیندا وەکو قەرەبووکردنەوە.
- ڕەهەندی دووەم: تیۆریی پانی.
- ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆری دووەم.
- ڕەهەندی سێیەم: تیۆریی بەرزی.
- ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆریی سێیەم.
- ڕەهەندی چوارەم: تیۆریی کات (زەمەن).
- ڕەهەندی چوارەم و ژنانی پاشماوەی ئەنفال.
- زەمەنی ڕابردوو لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال.
- زەمەنی ئێستا لای پاشماوەی ئەنفالەکان.
- زەمەنی داهاتوو لای پاشماوەی ئەنفالەکان.
- ڕەشپۆشی هێمای قەلەڕەشە.
- خەم و ئازادیی تاک.
- فیمینست و خەمی ئەنفال.
- تەنیا ژنان دەتوانن فیمینزم بن لە مەسەلەی ئەنفالدا؟!
- دەرئەنجام.

## ڕەهەندی چوارەمی فیمینزم و تیۆریی خەم لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال

ئەگەر ئەمڕۆ ژنانی کورد درک بەکەموکوڕییە لاسەنگییەکانی خەباتی خۆیان بکەن، بزانن پێویستە خەباتی خۆیان لە خەباتی کۆیلایەتی و ژێردەستی دەسەڵاتەوە بگوێزنەوە بۆ خەباتی خودی یان فیمینستی، ئەوکات بیر لە یەکخستنی ماڵی ژنی کورد دەکەنەوە نەک بەپێی گرژ و خاوی پێوەندیی نێوان دەسەڵات و بەرژەوەندییەکان ئەوانیش پێوەندییان بەهێز بێت، ئەو خەباتە فیمینزمییەش یەکێکە لە پێویستییە هەنووکەییەکانی جیهانی کوردی و فەرامۆشکردنی ئەو پنتەش ئەسپی خەیاڵی ژنان بەجیهانێکی یەکسانی کە هەموو مافەکانیانی تێدا دەستەبەر بکەن بەرەو هەڵدێر دەبات.

ئەمڕۆ ژنانی کورد ئەرکێکی زیاتر و قورستریان لەسەر شانە بەبەراورد بەژنانی جیهان، چونکە ئەگەر سەرجەم ژنانی جیهان لە کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکاندا وەکو سێ تەوەری هاوبەش، هاوبەش بن، ئەوا لە خەمی ژنانی پاشماوەی ئەنفال و ژنانی پاشماوەی کارەساتی هەڵەبجەدا تەنیا بەسەرهات و خەمی ژنی کوردە و تەنانەت ئەنفال ئەوەندەی لەسەر نەگوتراوە دەنگی پاشماوەکانی ئەنفال بگات بەجیهان. بۆیە کێشەی ئەوانە وەکو ڕەهەندی چوارەم و لە کێشەکانی تر گرینگترە و وەکو سێ ڕەهەندەکەی تر پێویستی بەکارکردن و لێکۆڵینەوەی زانستیی هەمەلایەنە هەیە، ئەوەش پێویستیی بەعەقڵێکی زانستیی فیمینستیی دروست هەیە، چونکە کێشەی ژنانی پاشماوەی ئەنفال لەوە گەورەترە هێندە بەساکارانە بخرێتە بەر باس و بۆچوونی زانستی. وەکو ئاماژەم بۆ کرد پێویستە کێشەی ژنانی پاشماوەی ئەنفال و هەڵەبجە بخرێتە یەک تەرازووی بەرامبەر بەتەرازووی سەرجەم کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، مەبەستمە بڵێم وەکو چۆن هەر سێ تیۆرییە فیزیکییەکە کە لە زانستی فیزیادا هاتووە (درێژی و پانی و بەرزی) بە سێ تیۆری ناتەواو



ژمێردرا لای ئەلبێرت ئەنشتاین و بەدوای ڕەهەندی چوارەمدا گەڕا و بەرجەستەی کرد کە ڕەهەندی کات (زەمەن) بوو، ژنی کوردیش ئەرکی خۆیەتی ئەمڕۆ متمانەی بەوە هەبێت کە ئەو سێ ڕەهەندەی تا ئێستا بۆی تێ کۆشاوە وەکو ڕەهەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی، تێکۆشانێکی ناتەواوە و پێویستە بەدوای ڕەهەندی چوارەمدا بگەڕێت کە تیۆریی خەمی لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال، واتە لە داهاتوودا ژنی کورد بڵێت تێ دەکۆشم بۆ کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری خەمۆکییەکانم، دەکرێ بگوترێ تیۆرییە فیزیکییەکانی ئەنشتاین چ پێوەندییەکیان بەکێشەی ژن و ئەنفالەوە هەیە بۆیە دەمەوێ بچمە سەر تیۆرییەکان و بۆچوونی خۆم لەسەر مەسەلەی ژنانی ئەنفال و کێشەی ژن بەگشتی بەو تیۆرییانەوە. بەڵام بەر لەوە دەمەوێ لەسەر مەبەستە سەرەکییەکەی خۆی بدوێم کە تیۆریی خەمە.

## تیۆریی خەم

ئەگەر خەم و پەژارە وەکو تیۆرییەک دابنێین ئەو تیۆرییەی کە لە سەدە دێرینەکانەوە زانایان و بیریارانی جیهان خۆیان لێ نەبواردووە و هەردوو میکانیزمی (تراجیدیا) و (کۆمیدیا) جێگەی بایەخ و باسەکانیان بووە، لە کورتترین دەربڕیندا تراجیدیا خەمە و کۆمیدیاش شادی، زادەی بیر و هۆش و هەستی زۆربەی فەیلەسووفەکانی جیهان بووە، بەڵام تراجیدیا مەودایەکی بەرفراوانتر و بوارێکی زیاتری لە بایەخ و تیۆرییەکانیان گرتووە وەکو فیکر و ئەدەب و زانست، ئەویش بەهۆی هاوتەریب بوون و وابەستەبوونی ڕاستەوخۆی خەم بەچمکەکانی تری مرۆڤایەتی و ژیانی مرۆڤەوە، وەکو خێر و شەڕ و ڕاست و درۆ و کارەساتە سروشتی و مرۆییەکان. کەمیش نین ئەو زانا و بلیمەتانەی کە بەنووسەری کارەساتەکان و خەمەکانی مرۆڤ ناسراون، وەکو بلیمەتان هیگل و نیتشە و فرۆید و ئەسخیلۆس... تاد بیرمەندانە ئەو واتایەیان خستووەتە بەر

تێبینی و ڕوانگەی جیاوازی خۆیان، وەکو پراکتیک و وەکو لێکدانەوەی چمکیش و بەستنەوەی بەڕیالیستەوە، لە ڕێگەی کارە وێژەیییە باڵاکانەوە، نموونەی کەسایەتیی نێو بەرهەمەکانی دیستۆفسکی، سارتر، ئەرستۆ، تۆلستۆی، کافکا، ستندال، گۆتە و مان و ...تاد کە تیۆریی خەمیان خستووەتە ڕوو بەرامبەر بەخەم و پەژارە و هەستەکانی مرۆڤ وەکو خێر و شەڕ و خۆشەویستی و ڕک و قوربانیدان و خۆپەرستی، هەموو لەسەر ئەوە کۆکن کە خەم و کارەسات ڕەگێکیان لە سروشتی مرۆڤدا هەیە، بەڵام ئەو خەمەی لە سروشتی مرۆڤدایە وەکو کۆمیدیا بەرامبەر بەتراجیدیا دەتوانین بڵێین خەمێکی هونەرییانەیە لە سروشتی مرۆڤدا، چونکە زۆرجار شێوەی مرۆڤ گوزارشت لە ناخی ناکات، هەر لەبەرئەوەشە دەکرێ کەسێک هەڵبژێرێت بۆ ڕۆڵێکی کۆمیدی و لەناخدا خەمبار بێت و پێچەوانەکەشی. ئەمە پێی دەگوترێ خەمی خۆڕسکی و سروشتی، جیاوازە لە خەمی کارەساتاوی یان مرۆڤی کارەساتاوی کە زانایان باسیان کردووە، هەروەها ڕاڤەی خەم لای ئەو بیریارانەش کە باسمان کرد جیاوازە لەو خەمەی کە فەیلەسووفە هاوچەرخەکانی وەکو ئیگلتۆن باسی دەکەن، ئەمەی دواییان تیۆرییەکانی خۆی زیاتر لە ڕەهەندەکانی شەڕ و کوشتوبڕ و برسیکردن و تیرۆریی سیاسی و ئەو ئاکارە دژ بەمرۆڤانەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زاڵن، قووڵ بووەتەوە کە پێی وایە ئەو (کاتەی ڕووبەری خەمەکان بەرفراوانتر دەبێت هەستیاریی مرۆڤیش بەرامبەر چمکەکە زیاتر دەبێت، کە سەردەمە خوێناوییەکان بەخەمبارتر و پڕ کارەساتتر دەژمێردرێت) زۆر کەسیش بەهەڵە دژی مرۆڤایەتی سەبووریی خۆی دەدات، بەڵام وەکو ئیگلتۆن ئاماژەی پێ کردووە سەدەی بیستەم سەدەی خوێن و شەڕ و گێرەشێوێنی و پێچەوانەی دیموکراسی بووە.

مرۆڤیش وای دەبینێت کە شارستانییەت بەو شێوە کاولکارانەیە هەڵگەڕاوەتەوە بەسەر خۆیدا، بەرهەمی سەرمایەداریش دەبێ بەهۆی لە دایکبوونی ڕۆشنبیرانێک کە لەسەر بنەمای خۆویستی و پێگە مادییەکان



جێگیر دەکەن. کەواتە لە هەموو ڕوانگەکانەوە خەم واتە تەسلیم بوون، (نیکیت) لە واتای خەمدا کارەساتەکان بەگەڕانەوەی مێژوو بۆ بەر لە کارەساتەکان دەچووێنێت، کەواتە ئەو نەتەوە و ئەو گەلەی تووشی کارەساتی گەورە و خەم دەبێت مێژوویشی لەڕووی داوونەریت و کولتوور و فاکتەرە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی بەر لە مێژوو بەر لە درککردنی مرۆڤ بەشارستانییەت و هیچ پێگەیەکی سیڤیلی نییە و، ئەگەر ئێمە سەیری کوردستان بکەین یەکێک لە پلانەکانی ئەنفال گەڕانەوەی کورد بوو بۆ بەر لە مێژوو بۆ بنەمای دواکەوتوویەتی و بێ جیاوازییەتی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی لەناو کوردا بەشێوەی نێگەتیڤەکە نەک پۆزەتیڤ، چونکە ئەوەی ڕۆحی بەرگری بوو ئەنفالی کرد، لادێ و شاری بەیەکەوە تێکەڵ کرد و ڕەتکردنەوە و پەسەندکردنی دروست کرد لەنێوان دوو لایەن کە هەتا ڕادەیەک خەڵکی کورد بەگشتی عەشایەرگەرییە و نزیکە لە داوونەریتی لادێییەوە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە جیاوازییەکی باشیش نەبووە و ئەو تێکەڵاوکردنە زیانی بەژیانی سیڤیلی کورد لەناو شارەکاندا و ئابووریی کورد لە دەرەوەی شار و داوونەریتی گوندنشینەکان نەدا و لەسەروو خەمی خۆیانەوە تووشی شوکێکش نەبوون، لەلایەکی تریش کردنی بەدوو کۆمەڵ یەکێکیان ئەو کۆمەڵەی کە دەبێ لە کۆمەڵگەی زۆرەملێی وەکو (نەصر و صمود)دا بژی و پێیان بگوترێ ئەنفال و لادێنشین کە بەتێڕوانینی بەعسیزمانەی ڕێژیمی دیکتاتۆر واتە پلە سێ لە مرۆڤایەتیدا، چونکە کورد خۆی ئەگەر پلە هیچ نەبووبێت پلە دوو بووە لە هاووڵاتی بووندا، بەڵام بۆ پاشماوەکانی ئەنفال هەوڵی داوە هەمیشە لە کوردە شارستاننشینەکانیش ڕووناکییەکی گوماناویتریان بخاتە سەر و بەپلە یەک کەمتر بیانژمێرێت و لە دەروونی خەڵکێکی دەربارەی خۆشی ئەوە بچێنێت، ئەمانەش هەموو کاریگەریی دەروونی لای هەردوولا بەجێ هێشتوو، کە کاریگەریی هەبووە و دەبێت بۆ سەرجەم تیۆرییە فیزیکی و ڕۆحییەکان لای مرۆڤ.

## غەم و تیۆرییە فیزیکییەکان

باسمان لەوە کرد کە خەم کاریگەریی دەروونیی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، ئاشکراشە هەموو کاریگەرییەکی دەروونی ڕەنگ دەداتەوە بەسەر تیۆرییە فیزیکییەکانی مرۆڤدا، ئەوانەی کە ماسلۆ بەخواردن و خواردنەوە و سێکس دایاندەنێت، بەپێی بۆچوونە زانستییەکانیش کەسایەتیی کارەساتاوی ئەو کەسایەتییە کە لە نووسینە ئەدەبییەکاندا بەباشی خراونەتە ڕوو، بەکەسایەتییەک دەژمێردرێت کە (گرێی ئودیب)ی هەبێت، بەڵام لە ڕووە زانستییەکانەوە زۆر جۆر گرێی جیاواز هەیە، کە سروشتی مرۆڤ بەرجەستە دەکات چونکە وێنەیەکی دووفاقیی لەلا دروست دەکات وەکو وێنەی فریشتە و دڕندە، ئەو کەسایەتییە ترسناکە بووە بەهێمای کارەساتاوی بۆ مرۆڤایەتی کە هەڵگری کۆمەڵێک فاکتەری ناتەبا و تاریک و دووفاقە، زۆربەی زانایان لە دۆزینەوەیدا پەکیان کەوتووە، چۆن خود و پاڵنەرە ڕاستەقینەکان خود و پاڵنەرە ڕاستەقینەکانی پێش مامەڵە و کردەی کەسی خەمۆکەوەن، لەبەرئەوەیە ئودیب کە توانیویەتی ڕاڤە و شیتەڵی کێشە دەروونییەکانی مرۆڤ بکات نەیتوانی ڕاڤەی خۆی بکات، لەبەرئەوەش فرۆید پێشنیازی ئەوەی کرد کە گرێی ئودیب وێنەی بەرجەستەکراوی سەرجەم مرۆڤایەتییە بێ جیاوازی، ئەویش نەک لەبەرئەوەی سەرجەم مرۆڤایەتی حەز بەکوشتنی باوک دەکات یان بنیاتنانی پێوەندییەکی نامەشروع لەگەڵ دایکدا، چونکە کێشەی ڕووبەڕووبوونەوەی ئودیب هێندەی پەیوەستە بەشوێنگە بابەتییەکەی لە ڕێکخستنی ڕەمزەکاندا، لەگەڵ بیرکردنەوە ناڕیالیستییەکان دەربارەی خۆی، یاخۆ جیاوازیی نێوان (ئەوی نوێنەری لای خەڵک و ئەوی نوێنەری لای خۆی)، چوون ئەو جۆرە کەسایەتییە زۆرجار لەنێوان جەستە و ئیدراکدا دەژین، لە بیریارانیشدا شکسپیر زانایانە گوزارشتی لەو مەسەلەیە کردووە لە شاکاری (ماکبێت)دا باس لەوە دەکات کە مرۆڤ هەستی پێ دەکات نەک ئەوەی کە دەیلێ، لێرەوە دەبینین لە دەربڕینە هەست پێکراوەکانەوە نەک



گوتراوەکانەوە گرینگیی ڕزگاربوون لە خەم دەردەکەوێت، بەدوورخستنەوەی خەمیش گێڕانەوەی هەست پێ کراوەکان ئاسانتر دەبێت و کێشی هەست پێکراوە نێگەتیڤەکانیش لەسەر دەروونی مرۆڤ کەمتر دەبێت... هەر ئەو کاریگەرییە ڕاستەوخۆیانەیە هەریەک لەو کردە سایکۆلۆجیانە دەبەستێتەوە بەچوار تیۆرییە فیزیکییەکەی ترەوە کە درێژی و پانی و بەرزی و ڕەهەندی چوارەمیش زەمەنە، چونکە هەریەک لەو تیۆرییانە بەپێی کارلێکراو و کارلێکەرە دەروونییەکان کاریگەریی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لەناو کۆمەڵدا لێ دەکەوێتەوە، لە هەمان کاتدا کاردانەوە نێگەتیڤییەکانی مرۆڤ کاردانەوەی خراپی بۆ سەر ئەو تیۆرییانە هەیە چ تیۆرییەکانی ئیبرەهام ماسلۆ و چ تیۆرییە ڕێژەییەکەی ئەنشتاین کە سێ تیۆرییەکەی تریش لەخۆ دەگرێت، چونکە بۆ مرۆڤ هەمان گوزارشت دەگرنەوە و هەوڵ دەدەم زۆر بەکورتی چەند سەرە پێنووسێک دەربارەی ئەو تیۆرییە فیزیکییانە لە دەرەوە تیۆریی ڕێژەیی، هەروەها پەیوەستبوونی ئەو ڕەهەندانە بەڕەهەندی چوارەم کە دەمەوێ ژنی کورد بۆ خۆی دابهێنێت، دەخەمە ڕوو بەگرێدانییەوە بەکێشە فیزیکییەکان.

### ڕەهەندی یەکەم: تیۆریی درێژی

دیارە زەمەنەکان لەگەڵ پێکەوەبوون و پێشکەوتنی مرۆڤدا دۆزرانەوە، زەمەنی یەکەم کە درێژییە TALL لە تەک یەک ڕەهەندا یەک دەهاتەوە ئەویش لە پێویستییەکانی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە، کە گەڕان بوو بەدوای خواردندا و تیرەکەی بەکار دەهێنا بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکەی، ئەو تیر هەڵدانەش هێڵێکی ڕاست و یەک ڕەهەند دەبڕێت ئەویش درێژییە، کەواتە زەمەنی یەکەمی تیۆرە فیزیکییەکان کە پێی دەگوترێ درێژی لەسەر بنەمای پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ماسلۆش یەکەم پێداویستی بەخواردن داناوە وەکو سەرەکیترین پێداویستی مرۆڤ کەواتە هەردوو تیۆرییەکە لێکچوون، هەردوو فاکتەرەکەش گەر لە

ڕابردوودا پابەندی توانای مرۆڤ بووە لە ڕاوکردندا، لە ئەمڕۆدا پابەندی بواری ئابوورییە و لێرەوە دەتوانین بڵێین سەرەتای داواکردنی مافی ژنان لە سەرەتای سەدەی حەڤدەوە بەداواکردنی مافی ئابووری و یەکسانیی کرێ و مانگرتنی کرێکاران دەستی پێ کرد کە ڕاستەوخۆ پابەندی نان و بژێوی ژیانە و پێوەندییەکی زۆری لەگەڵ هەردوو تیۆرییە فیزیکییەکەدا هەیە، چونکە ئابووریی ژنیش واتە تێربوونی بەشێکی زۆری خواستەکانیان لە خواردن هەتا کەسایەتیی ناو کۆمەڵ و خێزان و بەختەوەری خێزانی و متمانە بەخۆبوون، کەواتە تیۆریی یەکەم بۆ مرۆڤ واتای پێویستییە خۆراکییەکان بێت، بۆ ژن واتای پێداویستییە مەعنەوییەکانیش دەکات بۆیە کاریگەریی ڕاستەوخۆ دەکاتە سەر دەروونی ژن و ژنی دەروون ماندووش کاریگەری دەکاتە سەر ئەو تیۆرییە.

## ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆریی یەکەم

گوتمان هەردوو تیۆری لەسەر ئەوە کۆکن کە یەکەم تیۆریی خواردنە، هەموو مرۆڤێکیش درک بەوە دەکات و دەزانێت بەبێ خواردن ناژی، بەڵام ئایە مرۆڤی خەمبار سوود لە خواردن وەردەگرێت؟! بەپێی زانستی دەروونناسی مرۆڤی خەمبار هەمیشە ماندووە، ئەگەر کاروباری جەسەدیشیان نەکردبێت، ئەو ماندووبوون و پەژارەیەش کاریگەریی ڕاستەوخۆ لە خواردن دەکات، مرۆڤی خەمبار دەگات بەئاستێک لە دڵەڕاوکێ و پەژارە ڕیخۆڵەکانی تووشی سستییەک دەکات کە ڤیتامینی خواردنەکان بەباشی نەگوێزێتەوە بۆ لەش ئەو دوو فاکتەرەش کاریگەریی دەبێت بۆ سەر کار و چالاکیی مرۆڤ و هەروەها سووڕی خوێن و دابەشبوونی خواردن و ئۆکسجین بەسەر لەشدا، هەر بۆیە هەندێ ئەندامی لەش تووشی بەدخۆراکی یان کەمیی ئۆکسجین دەبێت، ئەگەر هەموو لەش تووشی نەبێت، ئەو کاتەش هۆرمۆناتی لەش تووشی ناڕێکی و تێکچوون دەبێت، ئەوکات چالاکیی جێبەجێکردنی کار تووشی زیان



پێگەیشتن و هەندێ جار لەناوچوون و ونبوون دەبێت، هەر ئەوەش وادەکات مرۆڤی خەمبار هەست بەخاوی و قورسی لەش دەکات.

ئەو کەسانەی وەکو ژنانی پاشماوەی ئەنفال ماوەیەکی زۆر لەژێر باری خەمدا دەمێنێتەوە خۆی درک بەچارەسەرکردنی خۆی ناکات (چونکە مرۆڤی خۆبەدەستەوەدەر بەخەم نازانێت پێویستی بەچارەسەرکردنە) هیچ لایەن و داوودەزگایەکیش خۆی ناکات بەخاوەنی بۆ چارەسەرکردنی لە دواییدا ئەو مرۆڤانە تووشی دۆخی ترسناکتر دەبن، جگە لەوەی نەخۆشییەکانی جەڵتەی دڵ و سەکتەی دەماغ لە دەرگای ئەو جۆرە خەم و پەژارەیەی مرۆڤ دەدات، ئەمە و جگە لە هەناسە توندبوون و دڵتەنگی و هەست بەتووڕەیی کردن پێش خەوتن و پاش لە خەو هەستان ئەمەش لەڕووی زانستی پزیشکییەوە پێی دەڵێن (نەخۆشی ماندوویێتیی درێژخایەن) و ماندوویێتی، ئەو زانستەش پەژارە و ماندوویێتی بەتێکچوونی کردەی لەش ناوزەد دەکات کە لەڕووی جەسەدی و فیکری و مەعنەوییەوە زیاد لە وزەی خۆی بەکاری بردووە، ئەوەش واتای لاوازبوونی ئەندامەکانی لەش دەکات و ناتوانن بەئەرکەکانی خۆیان وەکو پێویست هەستن، لێرەشەوەیە کە ئەندامەکانی لەش تووشی ئازار دەبن وەکو جۆمگەکان و دەمارەکان و قاچ و پشت، زۆربەی زانایانیش ڕایان وایە کە خەم و پەژارە ژنان زووتر و زیاتر تووشی ئەو نەخۆشی و ماندووبوونانە دەکات، ئەویش بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە هۆڕمۆنیانەی تووشی ژنان دەبێت.

ئەگەر ئەوانەی گوتمان تەنیا ئەو دێرەی کۆتایشی لێ وەربگرین نەک هەمووی، بۆمان دەردەکەوێت بەشێکی زۆری ژنان ئاڵوودەی ئازاری پشت و قاچ و جۆمگە و دەمارەکان دەبن و کەم ڕۆژ بەرگوێمان ناکەوێت ژنی کورد هاواریەتی کە ئەژنۆی نانووشتێتەوە و ناتوانێت بەڕێگادا بڕوات و ئازاری جۆمگەکانی ژیانی لێ تاڵ کردووە، ئەگەر کەسانێکیش نەختێک لە ژنانی پاشماوەی ئەنفال نزیک بووبێتنەوە کەمیان هەیە دووچاری ئەو جۆرە نەخۆشییانە نەبووبێت کە باسمان کردن لەگەڵ نەخۆشیی گەدەدا، بەڵام

بەدەگمەن ژنێک دەزانێت ئەو ئێش و ئازارانە سەرچاوەکەی بەهۆی خەمەوەیە و خەمە ئەوی ئاڵوودەی ئەو ئازارانە کردووە، هەموو دەیگەڕێننەوە بۆ ئەوەی کە سەرمایان بووە لە گەنجیدا یان لەو زەمەنەدا یان لە کاتی منداڵبووندا، هەتا ئێستا لە کوردستان خەمی مرۆڤ هێندە نەبوو بەخەمی پزیشکان و ڕۆشنبیران و ڕێکخراوەکانی ژنان کە هەوڵی چارەسەرکردن و کەمکردنەوەی خەمەکانی ژنانی ئاڵوودەبووی خەم بکەنەوە یان ڕۆشنبیریی زانستییان بدەنێ سەبارەت بەمەترسییەکانی، ئەمە وەکو لایەنی پزیشکی و دەروونی بۆ سەر ژن و پەیوەستبوونی ئەو کاریگەرییانە بۆ سەر خواردن و سوود وەرنەگرتن لە خواردن بەهۆی وەرنەگرتنی ڤیتامین لەلایەن لەشەوە. هەروەها لەڕووی ئابووریشەوە کاریگەریی تری هەیە.

## زیادەڕۆیی لە کڕیندا وەکو قەرەبووکردنەوە

زۆرجار دەکرێ ژنێک بۆ شتێکی ساکار بچێتە بازاڕ، بەڵام لە گەڕانەوەدا چەند کیسی گرتووە بەدەستەوە و کڕینیشی کردووە بەئامانج، ئەو کردەوەیەش لە زانستی دەروونناسیدا بە"ئارەزووی کڕین" ناوزەد دەکرێت، زۆرن ئەو بۆچوون و لێکۆڵینەوە جیاوازانەی لەسەر ئەو مەسەلەیە کراون، بەباوەڕی من هەندێکیان لە دەروونی ژنی کوردەوە دوورە، زیاتر باوەڕم بەو بۆچوونەیان هەیە، ئەو کەسانەی ئالۆدەی زیادەڕۆیی دەبن ئەو کەسانەن کە هەست بەتەنیایی و هەبوونی بۆشایی لە ژیانیاندا دەکەن، تازەترین لێکۆڵینەوە ئەوە دەردەخات کە بەهۆی تینوێتی ئەو مرۆڤانەوەیە بۆ سۆز، واتە ئەو کەسانە پێویستییان بەسۆزە و، لە سۆز دابڕاون.

بەڵام دکتۆر یوسری عەبدولحەسەن مامۆستای کۆلیجی پزیشکی دەروونناسی، ئالۆدەبوونی ژنان بەکڕینەوە بەئارەزووی گەیشتن بەدەستکەوت و دەسەڵات دەچووێنێت، بەوەش زیاتر هەست بەمتمانە دەکات بەتایبەت ئەگەر لە مێرد و کەسوکاری نزیک دابڕابن.

هەموو ئەو دەرەنجامە زانستییانە دەری دەخەن کە ژنانی بەشخوراوی



پاشماوەی ئەنفال لە هەموو ژنانی جیهان زیاتر پێویستیان بەوە هەیە بچنە بازاڕ و شت بکڕن، ڕاستە زیادەڕۆیی لە کڕیندا زیانی ئابووریی هەیە، بەڵام قازانجی دەروونیی هەیە هەتا ئەو ڕادەیەی کە مرۆڤ دەتوانێت خۆی چارەسەر بکات یان چارەسەر بکرێت، بەڵام ئێمە ئەگەر بەهۆی کەم بایەخیی کۆمەڵەکەمانەوە ئومێدمان بەو کارە نێگەتیڤەش هەبێت کە یارمەتیی لایەنی دەروونیی ژنانێکی خەمبار بدات ئەگەر لایەنی کەم وەکو متمانەبوون بەخودیش بێت وەکو لەو لێکۆڵینەوە زانستییانەدا دەردەکەون، بەڵام ژنانی پاشماوەی ئەنفال و مرۆڤەکانی پاشماوەی ئەنفال بەگشتی هێندە پشتگوێ خراون کە ناتوانن پێداویستییە زۆر گرینگەکان و پێویستییەکانی خۆشیان بەدەست بهێنن، تەنانەت خەمی نەبوونی ئازارەکانی لای ئەوان لە خەمی ئەنفال کەمتر نییە، بەتایبەت زۆریان پێشتر خاوەنی باخ و بێستان و مەڕومالات بوون و لە ئێستاشدا جگە لەوەی ئەوانە هەموو تێداچوون و هیچ پەرجوویەکیش نییە بۆی بگەڕێنەوە یاخۆ هاوکاری و یارمەتیی ئابووریی بدات بۆ گەڕانەوەی.

## ڕەهەندە دووەم: تیۆریی پانی

لە تیۆریی دووەمدا بەپێی شوێن و کات ئەو کاتە هاتووەتە بوون کە مرۆڤ بیری لە کێڵانی زەوی کردووەتەوە، بۆ ئەوەی بەروبوومی خواردن لە ڕاوکردنەوە بگوێزێتەوە بۆ کشتوکاڵ، بۆ مامەڵەکردنیش لەگەڵ زەویدا پێویستی بەپێوەریی پانی و درێژی هەبوو بۆ پێوانی ڕووبەری زەوییەکە هەر بۆیە هەردوو ڕەهەندی درێژی و پانی لەم تیۆرییەدا بەکارهێنران.

کەواتە تیۆریی دووەم لە تیۆریی بەرهەمهێنان و تێکۆشانی لەپێناوی ژیاندا، خۆراک سەرەکیترین فاکتەری بوونی بوو لە تیۆریی یەکەمدا بەرجەستە کراوە، بەرهەمهێنانی خۆراکیش کە زامنکردنی تیۆریی یەکەم دەکات وەکو قۆناغی دووەم دێتە ژماردن، واتە قۆناغی یەکەم بیرکردنەوە لە کەرەستە و قۆناغی دووەم تێکۆشان بۆ بەرهەمهێنانی کەرەستە و قۆناغی

یەکەم، ئەویش ساکارترین هاوکێشەیە کە ژیانی مرۆڤی تێدا بەرجەستە دەبێت. ئەو دوو تیۆرییەش ئامانجی مرۆڤ بووە لە ساکارترین بارودۆخدا و لە سەرەتای بوونەوە هەتا ئەمڕۆ.

## ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆریی دووەم

مرۆڤ بۆ ئەوەی بیر لە بەرهەمهێنان بکاتەوە پێویستە خاوەنی ئیرادەی بەهێز و خواستی بەرگری بێت بۆ ژیان، مرۆڤی خەمباریش ناتوانێت خاوەنی ئیرادەی بەهێز بێت، چونکە خەم سەرجەم فاکتەرەکانی هێز لاواز دەکات، لە باری ئاسایشدا نەک کارەساتی وەک ئەنفال بەخەم ئیرادەی بێ هێز دەبێت، لاوازبوونی ئیرادەش دەبێت بەهۆی لاوازبوونی دەسەڵات بەسەر پلانەکانی ژیاندا، ئەو کاتەش دەسەڵات بەرامبەر هەر پرەنسیپێکی ژیان شکست دەهێنێت، بەرگریش نامێنێت.

هێزی بەرهەمهێنان لای مرۆڤ پابەندە بەخواستی بەرگرییەوە بەرامبەر ئەو قەدەرانەی مرۆڤ لە تیۆرییە فیزیکی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان دادەبڕێت و خەونەکانی لەبار دەبات، بەڵام بۆ مرۆڤی پاشماوەی ئەنفال بەرهەمهێنانی ستاتیکای شوێنیش لەخۆ دەگرێت، شوێنی ڕابردوو خاوندارێتی بوو، ئەو شوێنە بوو ئەوی مرۆڤی لەسەر پەروەردە بوو، ئەوی شوێنیش بەدەستی ئەوی مرۆڤ گەشەی کردبوو و بەروبوومی هەبوو، خاوەنی ڕابردوویەکی بەرهەمهێنەر لە ئێستادا بووە بەموستەهلیک، واتە خاوەنی ئەو شوێنە بووە کە بەرهەمی ژیانی خۆی تێدا بەرجەستە کردبوو وەکو لە تیۆریی دووەمدا هاتووە بۆ بەرگری کردن لە مانەوەی تیۆریی یەکەم. لەو کاتەوەی شوێن لە نەست و ژیانی پاشماوەی ئەنفالدا، ئەنفال کرا، هیچ هەوڵێکی مرۆڤدۆستانە نەدرا بۆ دروستکردنی هاندانیان بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوە، ئەو مرۆڤانە هەموو خاوەنی باخ و بێستان و مەڕومالات بوون، پاش ئەنفال خاوەنی تەنیا یادگارییەکانی هەبوون و ئەوانە هەمووی بووە بەخەیاڵ. بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەش توانای



مادی ئەوان تەنیا بێ ئومێدییان پێ دەبەخشێت و هاوکاریی دەسەڵات و حکوومەتیش لەوە باشتر نییە و ئەوانەشیان کە توانای بەرهەمهێنانەوەیان هەبێت و لەڕووی وزەوە ئەو توانایەی جارانیان نەماوە، وەکو ئەوەی پێشتر خێزانە کوردە ئەنفالکراوەکان هەموو خێزانێک لە چەند کەسێک پێک هاتبوون و هەموانیش دەزانین کە خێزانی لادێنشین بەهەرەوەز و هاوکاری هەموو کارێک دەکەن، کارەکانیان دابەش کرابوو بەسەر چەند کەسێکی خاوەن ئیرادە و هێزدا، نەک تەنیا یەک کەس یان دوو کەسی واتە تاقانەکانی دوای ئەنفال کە هێز و ئیرادە و توانایان ئەنفال کراوە و وردبووە لەژێر باری خەمدا... زۆریشیان ئاوات دەخوازن کە خاوەنی ئاژەڵ بن و بگەڕێنەوە لادێیەکەی خۆیان.

(بەگیانی ئەنفالکراوەکانم ئەگەر خاوەنی یەک تاقە مانگا بوومایە ئەو ڕۆشتنەوەیە دەڕۆشتمەوە بۆ لادێیەکەی خۆم، هەتا مردن دوو پێم نەدەکردەوە بەصمودی کاولدا)

ئەمە قسەی ژنێکی ٤٥ ساڵە کە کوڕێک و مێرد و بووک و کوڕەزایەکی ئەنفالە، ئەمە نموونەیەکی ساکاری هەزاران خۆزگە و سوێندی هاوشێوەیە، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیار نەبووە لای بەرپرسانی ئەو نەتەوەیە، ئایا ئەو قوربانییانەی ئەو ژنە و سەرجەم پاشماوەی ئەنفال لە ئاستی ئەو خۆزگە ساکارەدا نییە کە دەبێ بەهۆی جارێکی تر بنیاتنان و ژیانەوەی ژیانی ڕابردوو کە لای ئەو پابەندە بەستاتیکای شوێنەوە و ئەوەش پاڵنەرێکی خۆڕسکی دەروونی هەموو مرۆڤێکە، کەواتە کێ بوو بەهۆی کەڵەکەبوونی خەمەکانی ئەنفال و هێندە بێ بایەخ سەیری دەکات، کە ناتوانێت خەمەکانی فەنابوونی گشتی سووک بکات تەنیا بۆ فەنابوونی جەسەدی و ئەنفالی پانتاییی ژیان و شوێن و بەرهەمهێنانی بۆ قەرەبوو بکاتەوە.

## ڕەهەندی سێیەم: تیۆریی بەرزی

ئەم تیۆرییە کاتێک هاتە هزر و کاری مرۆڤەوە کە بیری لە دروستکردنی

خانووبەرە کردەوە وەکو ئارامگەیەک بۆ ئەوەی تێیدا بحەوێتەوە و بەرهەمی تیۆریی دووەمی تێدا بخوات، بۆیە بیری بۆ ڕەهەندی سێیەم ڕۆیشت کە بەرزییە و بەبێ ئەو بەرزییە نەیتوانیوە بیر لە هاوکێشە ئەندازەییەکان بکاتەوە، پاش دۆزینەوەی هەر سێ تیۆریی درێژی و پانی و بەرزی گەیشتووە بەوەڵامە ئەندازەییەکان کە چۆن دایبڕێژیت، ئەمەش ئەگەر وەکو زانستی کۆمەڵایەتی لێکی بدەینەوە کە ئەو تیۆرییە فیزیاییانە ڕاستەوخۆ بەستراون بەزانستی کۆمەڵایەتی و سەرەتای دەرکەوتنیشیان لە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتووە، نەک ماتماتیکی و، فەلسەفییەکانی ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەر سێ تیۆرییەکە تەواوکاری یەکن لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە و مرۆڤێکی ئاسایی پێویستی بەخواردن هەیە، بۆ ئەوەی بخوات چێژ وەرگرێت پێویستە شوێنگەیەکی هەبێت بۆ حەوانەوە، فاکتەری هاندەری تێکۆشان و بەرهەمهێنانە، خواستی بنیاتنان، مرۆڤی لە ئەشکەوتەوە گواستەوە بۆ ئارامگەیەکی هێمن کە پرۆسەی ژیانی خۆی وەکو مرۆڤێکی سیڤیلی تێدا جێبەجێ بکات ... ئەمەش ڕاستەوخۆ پابەندە بەتیۆریی شوێنەوە، کە کاریگەریی ئێجگار گەورەی لەسەر دەروونی مرۆڤ و گەشەکردنە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجییەکان هەیە و هەبووە، بەبنەمای بوونیشی دەژمێردرێت هەر بۆیە بەر لە هەموو تیۆرییەکان درک بەو تیۆرییانە کران و دۆزرانەوە.

## ژنانی پاشماوەی ئەنفال و تیۆریی سێیەم

ئەگەر تیۆریی بەرزی تەنیا وەکو لایەنی زانستی تیۆریی جێگە وەرگرتن بەرجەستە بکات، ئەوا بەرزی لە بیرکردنەوەی بنیاتنانی ئارامگەیەکەوە هاتووە، بۆ حەوانەوە کە خانووبەرە و هاوکێشە ئەندازیبییەکانە، ئەوانیش لە نەستی مرۆڤی ئەنفالدا ئەو شوێنەیە کە بلدۆزەرەکانی بەعس خاپووری کردن و سووتاندنی، ئەوان یادگاری تۆپ و تۆز و دووکەڵی سووتاندنەکەی



بووە بەتاڵترین یادگاری لەلایان و یادگارە شیرینەکانی دەسڕێتەوە.

بنیاتنان لای مرۆڤی پاشماوەی ئەنفال بنیاتێکی لە دەستچووە، کە خەمی لە دەستچوونی ئیرادەی مافی گەڕانەوەی لێ سەندنەوە، بەتایبەت ئەو مافەی دەچێتە خانەی مافی سروشتییەوە کە لیڤی شتراوس سروشتی بەهەموو ئەو فاکتەر و مافانە دەزانێت، گشتییە و هاوبەشە لەنێوان مرۆڤەکاندا، بنەمای هەبوونی مافی سروشتیش لە مێژووی فەلسەفەدا دەردەکەوێت کە پابەندی هێز و توندوتیژییە.

لێرەدا مرۆڤی پاشماوەی ئەنفال توندوتیژی مافی سروشتیی لێ دەستێنێتەوە و ئەوانەی سپینۆزا جەختی لەسەر کرد کە ئەو مافە ڕەت دەکرێتەوە بۆ (هەموو بوویەک مافی مانەوەی هەیە لەسەر بارودۆخی خۆیدا)، لە کارەساتی ئەنفالدا پێچەوانە کرایەوە و هەموو شتەکان مافی سروشتیی لێ سەندرایەوە و سروشتی جەنگەڵی پێشکەش کرا، بینینی ئەو هەڵگەڕانەوەیە لە سروشتی دەوروبەر و شتە تایبەت و مۆڵکدارێتییەکان زۆرجار مرۆڤ تووشی نەهلستی و بێ ئومێدی دەکەن، لەوەی کە ڕێسایەک هەیە بۆ گەڕانەوەی سروشتی شتەکان، لەوەی کە مرۆڤ مافی بوونی ڕۆحیی خۆی و سروشتیی دەوروبەری هەیە.

تیۆریی سێیەم کە لە بیری دروستکردنی خانووبەرەوە سەرچاوەی گرتووە لەناو کۆمەڵی ئێمەدا کاریگەریی لەسەر ژن زیاتر هەیە هەتا پیاو، چونکە جگە لەوەی سروشتی ژن هەبوونی ماڵ زیاتر دڵنیایی و متمانەی دەداتێ و زیاتریش عەودالّی دروستکردنیەتی، بەتایبەت بۆ ژیانی پاشماوەی ئەنفال لەبەرئەوەی لادێنشین بوون لە هەبوونی هەر سەرچاوەیەک لە ماڵی هاوسەریەتیدا یان باوکدا لە سەروەت و سامان و دەغڵودان و مەڕوماڵات بەشی شێریان لە بەرهەمهێناندا هەبووە، لە هەموو جێبەجێکردنێکدا کاری قورس و زۆریان هاوشانی پیاو لەسەر شان بووە، جگە لەوەی کاری ژنی لادێنشین بێ کرێ، واتە هاوبەشە و خاوەندارە لە هەر شتێک لە ماڵی پیاودا هەبێت گەرچی بەپێی یاسا دواکەوتووەکانی کۆمەڵی ئێمە ئەو

مافەی نادرێتێ ئەگەر هەر گرفتێک هەبوو، بەڵام بۆ خۆی بەردەوامی لە کار و قوربانییەکانی ژندا واتە ئەگەر بەیاساش لێی دوور بخرێتەوە بەهەست وا هەست دەکات هەرچییەک دەکات بۆ خۆی دەکات. واتە لەپێناوی بەرگری لە خۆیان و خێزانی خۆیان ئەو ئەرکە قورسە بێ بەرامبەرەی کردووە، کە ئەمەیان بەپرۆسەی ئەنفال بێ ڕەحمانە بەرەو نادیار برا و خرایە چوارچێوەی کۆمەڵگەی زۆرەملێوە.

لە لای فاسلۆ تەوەری سێیەمی پێویستە فیزیکییەکان سێکسە، سێکسیش لە ژیانی ژنی کورددا هەرەمەکییانە و ئارەزوومەندانە نییە، بگرە پاش هەڵبژاردنی هاوسەر و پێکەوەنانی خێزانە، بۆیە بۆ ژنی کورد تەوەری سێیەمیش هەر خێزانە و تەنیا لە ڕێگەی خێزانەوە دەتوانێت بەو مافە بگات، بەڵام پاشماوەی ئەنفالەکان زیاتریان ژنن و زۆریشیان کاتی ئەنجامدانی ئەنفال گەنج بوون و لە لوتکەی بەرهەمهێنانی خێزانیدا بوون، کە مێردیان ئەنفال کراوە و ئیتر بەدیار ئومێدی گەڕانەوەیان تەسلیم بەخەم بوون، بەهیچ شێوەیەک بیریان لە دروستکردنی خێزان نەکردووەتەوە بۆ جارێکی تر، کە ئەوە ساکارترین مافی خۆیانە، دەکرێ بەشێکی بەهۆی تەسلیم بوون بووبێت بەخەم، چونکە مرۆڤی خەمبار بیر لە نوێبوونەوەی ژیان ناکاتەوە، لە بنەمادا ژیانی لێ دەبێت بەبارێکی قورس، لەلایەکی ترەوە لەناو داوونەریتی دواکەوتووی کورددا ژن خاوەنی هیچ مافێکی سروشتیی خۆی نییە، پێیان وایە ئەگەر پیاوانی پاشماوەی ئەنفال ژنیان هێناوە ئاساییە، چونکە بەبۆچوونی ئەوان پیاون و بێ هەبوونی سێکس ناژین، بەڵام بۆ ژن شەرمە بەهیچ شێوەیەک بیر لە سێکس بکاتەوە و تەنانەت خەتەنەشی دەکەن بۆ ئەوەی لە پیاوی خۆشی چێژ لە سێکس وەرنەگرێت و لە مرۆڤایەتی و لە سروشتی خۆی دەردەکەن، خۆ ژنێک پیاوی نەمێنێت و بیر لە پێکەوەنانی خێزان بکاتەوە ئەوە بەشەرمەزارتر سەیری دەکرێت، لەگەڵ ئەوەی لە ناو کورددا ئابووری زیاتر دەکەوێتە سەر شانی پیاو و ژن ناتوانێت هەروەها بەتەنیا دەستەبەری بکات، ژیانیش



لەوە کێشەترە، لەنێو کۆمەڵێکدا فەلسەفەی ژیانیان لەسەر درۆ و تۆمەت و وتی وتی بۆ ژن وەستاوە، ئەو هۆیانە و زۆر هۆی تریش ژنی کوردی لە ژنانی تر زیاتر بەستووە بەمەسەلەی دروستبوونی خێزان و هەبوونی خانووبەرە وماڵەوە، چونکە ژنی کورد لە دەرەوەی ماڵی باوک یان مێرد ژیانی مەحاڵە، هەر بۆیە ماڵ لای ژن واتە ئەو شوێنەی تێیدا هەست بەنەوازش و متمانە و دڵنیایی دەکات، ئەو شوێنەی ئەگەر لە کیسی بدات بەر دەمی شەرعییەتی جەنگەڵ و وەحشیگەرییانەی کۆمەڵ و قەدەر دەکەوێت. ئەنفال واتەی هەڵوەشانەوەی خێزان بوو، کە وەکو داوونەریت هەموو بوونێکی ژنی کورد دەگرێتەوە، وەکو تیۆریی ئەندازیاریش لانەی حەوانەوە و ئاسایشی دەگرێتەوە، وەکو پێویستیی فیزیکیش سێکس و کاردانەوە ڕۆحییە مەشرووعەکانی خۆی دەگرێتەوە، ئەنفالی هاوکێشە ئەندازەییەکان، واتە ئەنفالی چەند لایەنێک لەلای ژنانی پاشماوەی ئەنفال.

## **ڕەهەندی چوارەم: تیۆریی کات (زەمەن)**

زانای گەورە ئەنشتاین لە زانستی فیزیادا یەکەم و تەنیا بیریارێک بوو بیری لە ڕەهەندی چوارەم کردەوە کە (زەمەن)ە و گوتی ئەو کەونەی ئێمەی لەسەر دەژین لە چوار ڕەهەند پێک هاتووە، کە درێژی و پانی و بەرزی و کاتە، بەبێ ڕەهەندی کاتیش تیۆرییە فیزیکییەکان ناتەواون، بەو شێوەیە ڕەهەندی چوارەمی خستە نێو پەیڕەو و حیساباتی خۆیەوە، ئەو جیاواز لە ڕەهەندەکانی تر کە دەتوانرێت ببینرێت و بگیرێت و نەخشەی بکێشرێت، ئەو ڕەهەندە زەمەنێکە نابینرێت، بەڵام مرۆڤ تێیدا دەژی و هەستی پێ دەکات، وەکو یەکێک لە پرەنسیپەکانی بوونی زەمەن دابەش کراوە بەسەر هەموو ساتەکانی بووندا کە ٣٦٥ ڕۆژ دەکات لە ساڵێکدا لە سەر زەوی، بەڵام ئەو زەمەنە لەگەڵ ئەستێرەکانی تردا جیاوازە، بۆ نموونە ساڵێک لەسەر ئەستێرەی (عەتارد) سێ مانگە بەپێی حیساباتی ئێمە لەسەر

زەوی، هەروەها لە سەر ئەستێرەی (بلۆتۆ) ساڵێک ٢٤٨ ڕۆژە بەپێی ژماردنی ساڵ لەسەر زەوی، مرۆڤ کاتێک بیری بۆ زەمەن و پەی بردن بەزەمەن کرد کاتژمێری دروست کرد، پەی بردنیش بەزەمەن واتە ئۆرگانیزەکردنی کاروبار و ژیانی مرۆڤ و چوونە ناو ژیانە ڕەسمی و مۆدێرنەکان، واتە درککردن بەپرۆگرامێک بۆ ئەوەی ژیانێکی پرژوبڵاو کۆبکاتەوە و ئەرکەکانی دابەش بکات بەسەر ئەو زەمەنانەی کە گونجاون بۆ بەرژەوەندی ئەوی مرۆڤ و لە ونبوونی زەمەنەکانی نێوان شەو و ڕۆژ و ئەرک و مافدا دەری بهێنێت بۆ ڕێکخستنی ژیان و دادەوەری لە ئەرک و مافدا و فاکتەرە سروشتییەکانی تری ژیان کە دۆزینەوەی زەمەن توانیویەتی ڕێکخەری بێت.

## ڕەهەندی چوارەم و ژنانی پاشماوەی ئەنفال

زەمەنی ئەنفالکردن و زەمەنی توندوتیژی، تێکشکاندنی سەرجەم ئەندازە و هاوکێشە فیزیکییەکانە، زەمەنێک کاتژمێری تێدا دەگات بە٢٥ی دوای زەمەن و بنیاتنان و بەردەوامی و خواردن و ژیانی تێدا کۆتایی دێت، ئەو کاتەش بەردەوامی نامێنێت زەمەنیش دەوەستێت، لە دەرئەنجانی بەرهەمهێنەرەوە دەوەستێت و دەبێت بەزەمەنی ئیستیهلاکی. لە دەرەوەی تیۆرە فیزیکییە ڕێژەییەکەی ئەنشتاین دەتوانین بڵێین زەمەن دابەش دەکرێت بەسەر ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا، مرۆڤ دەتوانێ بە تاڵ و شیرینەکانی ڕابردوودا بچێتەوە لەژێر فێربوون و ئەزموونەکانیدا ئێستای جوانتر دروست بکات بەئەندێشەی داهاتوویەکی بەرهەمهێنتر و بەختەوەرتر، کە ڕەگی خەمی تێدا بکوژێت، بەڵام ئەنفال واتە فەنابوونی هەرسێ زەمەنەکە، چونکە ئەو دڕندەیە لەسەروو توندوتیژیشەوە بوو، لە کاتێکدا توندوتیژی واتە ئەو ڕەوتە قێزەونەی کە هەموو جووڵەیەک لەبار دەبات. زەمەنی پاشماوەی ئەنفالیش بەو شێوەیە لەبارچوو.



## زەمەنی ڕابردوو لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال

زەمەنی ئەرک و ماندووبوون و بێ بەش لە ماف و سیڤیلی ژیان، ڕابردووییەکی پڕ خەبات و تێکۆشان بۆ داهاتوویەکی باشتر تێکەڵاو بەزەمەنی سفری لەناوچوون و فەنابوونی سەرجەم بوونەوەر و شتە مەتریالی و ڕۆحییەکانی ئەوانی مرۆڤ، زەمەنی گۆڕینی ستاتیکای زەمەن بۆ وەستانی هەموو ستاتیکایەکی بەرهەمهێنەر، بەفیڕۆچوونی هەموو تێکۆشانەکان، زەمەنی کۆستی ڕەش و بێ ئومێدی و نەهێشتنەوەی بۆشاییەک بۆ بیرکردنەوە جگە لە حەپەسان و مەلەمابوون بەشۆک، نەگەیشتن بەوەڵامی ئەو پرسیارانەی کە لە مرۆڤی حەپەساو سەرهەڵدەدەن، بەڵام ئەوی چەوساوە ناچێتە لای چەوسێنەرەکەی و بپرسێت بۆچی دەمچەوسێنیتەوە، چونکە چەوساندنەوە بەهەر شەرعییەتێک بێت نامەشوروعە، جگە لەوەی توندوتیژی و فەنابوون وابەستەی هیچ ڕێسا و یاسایەکی جێگیر نییە، بگرە هێزی ئاکتیڤبوون لەوەوە وەردەگرێت کە وابەستەی هیچ ڕێسایەکی جێگیر نییە هەر لەبەرئەوەشە ترسناکە و کاتێک ڕێژیمێکی دیکتاتۆر و بکوژ ئەنجامی دەدات لە دەرەوەی هەموو بەهانە و مەشروعییەتێکی مۆراڵییەوەیە.

## زەمەنی ئێستا لای پاشماوەی ئەنفالەکان

ئێستا پاشماوەی ئەنفال و ژنانی پاشماوەی ئەنفال زەمەنی برسیەتی و وردبوون لەژێر خەم و جارێکی تر حەپەسان بەرامبەر بەبێ وەفاییی ئەوانەی ئەوان لەپێناویاندا ئەنفال بوون، زەمەنی ونبوون لەنێو دۆخێکی دووفاقی نیوە سیڤیل و نیوە دێهاتی کە هیچیان لەگەڵ خەمەکانی ئەواندا یەک ناگرنەوە و برینی ئەوان سارێژ ناکەن، مرۆڤیش کاتێک خۆی لەناو کارەساتێکی ترسناک و تۆقێنەری وەکو ئەنفالدا دەبێت، هەموو زەمەنەکانی بیرکردنەوە و ئیرادە و بەرگری و تەنانەت زەمەنی سۆزیش لە بزاوتن دەکەوێت، تەنیا چارە بەخۆ بەدەستەوەدان یان هەڵهاتن دەزانێت،

هەر ئەو پاڵنەرە دەروونییەش وای کرد کە هەندێ دایک و باوکی کورد لە ئەنفال و هەڵەبجە و کۆڕەودا منداڵی خۆیان بەجێ بهێڵن، کە دەکرێ زەمەنی ئێستا لای هەندێکیان پێداچوونەوەی ڕابردوو و سەرکۆنەی ویژدان بێت، کە گوناهی ئەوی تێدا نەبووە، با بپرسین ئەگەر مرۆڤێکی ڕۆژهەڵاتی کە بەسۆزدار ناسراوە لە لووتکەی سۆزەوە بگات بەداوێنی بێ ئیرادەیی و خۆ بەدەستەوەدان و بێباکی یان بیرچوونەوەی بەشێکی گەورە لە خۆی لەپێناوی پاراستنی بەشەکەی تردا کە خودی خۆیەتی، دەبێ ئەو حەشرە تۆقێنەرەی ئەنفالکراوەکان و مرۆڤەکانی پاشماوەی ئەنفال بینیوویەتی چەند ترسناکانە کاریگەریی خۆی لەسەر سایکۆلۆجییەتیان چەسپاند بێت و چەند گران بێت لایان بەزەمەنی ڕابردوودا بچنەوە و بنیاتی زەمەنی ئێستای نوێی لەسەر بنێن دەبێ واتای زەمەن چەند تۆقێنەر بێت لەلایەکی تر هەندێ جار زەمەنی پەشیمانییە لە شۆڕش پاش ئاشکرابوونی ئەو هەموو شۆڕشی ساختە و وڵاتپەروەریی ناڕاست و بێ وەفایی و مافخورانەیان، دەمەوێ لێرەدا تەنیا شەهیدێکی قادسیەی سەدامی دیکتاتۆر و قوربانییەکی ئەنفال بکەم بەنموونە کە خۆم گوێم لێ بووە کاریگەرییەکی لەسەر بەجێ هێشتووم هەمیشە لەگەڵ هەر خیانەتێکی لایەنێکی کوردی بیرم دەکەوێتەوە و دووبارە دێتەوە بەر گوێم، ئەویش ڕای دوو ژنە لە دوو کات و شوێنی جیاوازدا.

یەکەم ساڵی ١٩٨٩یە، ژنێک بەیەکێکی تر دەڵێت پێ دەچێت ئێرەیی بەو هەموو خزمەتەی بەعس بەرێت کە خزمەتی ئەو خێزانە دەکات خاوەنی شەهیدێک بوون لەڕووی عەقڵییەوە هەندێک کێشەی کەمی هەبووە.

– جا بۆ ( ) خەم دەخوات، خۆ نان نەبوو بیخوات شەهیدبوونی کوڕە شێتۆکەکەی کە گیری خواردبوو بەدەستییەوە بۆی بوو بەخێر، پێی بوو بەخاوەنی خانوو قەسر و پارەی باش و سەیارە و لە نەخۆشخانە چارەسەرکردنی نەخۆشی بەخۆڕایی.

ژنی دووەم ژنێکی خاوەن دوو کوڕی ئەنفالە ساڵی ١٩٩٦ و کاتی



شەڕی براکوژی، کە کەسێکی تر دەیەوێ بەچوونی کوڕەکەی بۆ ڕیزی پێشمەرگایەتی هەندێک لە باری قورسی نەبوونیان لەسەر شان سووک ببێت، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:

– بەخوا ئەگەر لە برسان مردبم ناهێڵم کوڕەکەم ببێت بەپێشمەرگە، سبەینێ ئەمیشم وەکو ئەوانی تر تیاچوو چی بکەم و چی بێژم، کێ منەت دەزانێ و کێ لێت دەپرسێت، بۆ ئەوانی تر تراندیان بەلایەکماندا تا ئەگەر ئەمیشم نارد بیترێنن بەلاکەی ترمانا.

ئەو بۆچوونە خۆڕسکەی نێوان دوو ژنی نەخوێندەوار، دەربارەی دوو سیستەم و دەسەڵاتی جیاواز، کە ئەوە ڕای کەسانێکی نەخوێندەوار و دوور لە سیڤیل دەکات و تەنیا بەپاڵنەرە هەستییەکان ئەو قسەیە دەکەن، ئەی ئەگەر خوێندەوار و ڕۆشنبیر بن و لێکدانەوەی عەقڵێشیان بۆ کۆمەڵی دوا ئەنفال و هەڵوێستی سیاسی هەبێت بەرامبەر بەئەنفال چی دەڵێن؟ ئەو بۆچوونە ساکارە دەهێنێت کە بڵێین سەرجەم زەمەنەکانی پاشماوەی ئەنفال سەرابێکە و تەنیا ڕووبەڕووی خۆیان کراوەتەوە، زەمەنێکە بەپێی بەرژەوەندیی سیاسی دێتە بوون و بەرژەوەندییەکی تر وەلاوە دەنرێت و بیر دەبرێتەوە، ئەو زەمەنەی لەگەڵ بەرژەوەندیی دەرەوەی ئەنفالدا سەرهەڵدەدا و دێتە بوون.

## زەمەنی داهاتوو لای پاشماوەی ئەنفالەکان

زەمەنی داهاتوو بۆ کەسانی پاشماوەی ئەنفال زەمەنی چاوەڕوانیی کوشندە و دەستگرتن بەئومێدی وەهمییەوە، مرۆڤی پاشماوەی ئەنفال هێندە بەسەختی دەروونییان تووشی شۆک بووە، لەگەڵ ئەوەی هەندێکیان خۆیان لە زیندانەکانی ئەنفال گەڕانەوە، بەچاوی خۆیان دیبوویان بەدەیانیان لێ کراوە بەژێر گڵەوە، لەگەڵ ئەوەی کە دەیان کەس شاهیدی ئەوەی دا کە ئەنفالکراوەکان زیندەبەچاڵ کران، لەگەڵ ئەوەشدا وەکو ئومێدی ئەو کەسە دەکەوێتە نێو زەریا و دەست بەتەڵەپووشێکەوە دەگرێت بۆ ڕزگاربوون

ئومێدیان بەخەیاڵی گەڕانەوەی ئەنفالکراوەکانیان بووبوو بەئومێدی زەمەنی داهاتوو، گۆڕینی زەمەنێکی ڕیالیستی بۆ زەمەنێکی نادیار و ناڕاست، کە خەمێک دروستی کردووە و زەمەنە واقعییەکەی لێ دەگۆڕێت بۆ زەمەنێکی وەهمی. لە کاتێکدا مرۆڤ خاوەنی پرۆژە و ئامانج و خواستە، هەر چالاکییەکیش لەو چالاکییانە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی زۆربوون و یەکبوون، پێچەوانەکەشی ڕسک بەئامانجی ئەو کەسەوە دەکات کە ئامانجی تاکە کەسە، هەموو ئامانجێکیش پاڵنەری ئامانجێکی ترە کە لە میانەیەوە چارەنووس دەستنیشان دەکرێت. ئەمانەش لە زەمەنی داهاتووی ئەنفالدا بووە بەچاوەڕوانی فریادڕەس لە دوو جۆردا خۆیان دەبیننەوە، یەکێکیان ئەو فریادڕەسە ئیلاهییەی چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکات بەپەرجوویەک ونبووە ئەنفالکراوەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، ئەوی دیان ئەو فریادڕەسەی لەپێناوی ئەنفالبووەکانیدا ئەو لەو هەموو کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و دەروونییە دەردەهێنێت بۆ ئەوەی کە خەونی پێوە دەبینێت. ئەو خەونەش لە هەمان کاتدا دەچێتە خواستی گواستنەوەی بەهای ئەنفال لە تاکەوە بۆ کۆمەڵ، لە گرووپەوە بەگشتی.

## ڕەنگ لای ژنانی پاشماوەی ئەنفال

ڕەنگ زمانێکی دەربڕی دیکەی مرۆڤە، ئاماژە و واتای جیاواز دەدات بەبەرامبەر، زانستەکانی دەریان خستووە ژن دەتوانێت قسە بکات بەبێ ئەوەی یەک وشە بدرکێنێت، ئەویش لە ڕێگەی ئەو پەیامانەوە لە ڕێگەی ڕەنگ و شێوەی دەرکەییەوە دەیدات بەبەرامبەر، واتە لە ڕێگەی پۆشاکەکانیەوە.

(سیگمان مارتن)ی زانیار لەبواری چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان لە ڕێگەی ڕەنگەوە، لە لێکۆڵینەوەیەکیدا دەربارەی ڕەنگ و پێوەندیی بەمۆن (مەزاج)ی ژنەوە دەری خستووە کە پۆشینی ڕەنگەکان چەندین کاریگەریی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لەسەر ئەو ژنە هەیە کە



ڕەنگەکەی پۆشیوە هەروەها لەسەر کەسانی دەوروبەری ئەو ژنەش، کاریگەریی لەسەر کەسایەتی و هەتا مامەڵە و بیرکردنەوەشیان هەیە، هەر بۆیە لێکۆڵینەوەکەی ناوناوە (ڕەنگی پەسەندت ڕەنگدانەوەی کەسێتیتە). هەروەها دکتۆر حەنان سالم مامۆستای دەروونناسی لە کۆلێجی ئاداب پێی لەسەر ئەوە دادەگرێت کە هەر ڕەنگە کاریگەریی خۆی هەیە لەسەر دەروونی مرۆڤ، بەتایبەت ژن، چونکە مرۆڤێکی هەست ناسکترە، هەروەها دەڵێ ئەو تیشکە نەبینراوانەی ڕەنگ دەیهاوێژێت کاریگەریی گەورەیان لەسەر سەنتەرەکانی هۆش هەیە لەناو مۆخی مرۆڤدا. من لێرەدا مەبەستم نییە باس لە کاریگەریی چاک و خراپی سەرجەم ڕەنگەکان بکەم بگرە دەمەوێ بچمە سەر ڕەنگی مەبەست و بەکارهاتوو لای ژنانی پاشماوەی ئەنفالەکان کە ڕەنگی ڕەشە.

لە ئەنجامدا ئەوان و زۆر لە دەروونناسانی تر لەسەر ئەوە کۆکن ئەگەر ڕەنگی ڕەش لە ئاهەنگەکان و کارە ڕەسمییەکاندا نیشانەی برجوازییەت و ئاستێکی بەرزی کۆمەڵایەتی بگەیەنێت، لە کاتی ئاساییدا و درێژ پۆشینیدا کاریگەری تیژ و ڕاستەوخۆی نێگەتیڤی لەسەر دەروونی مرۆڤ هەیە.

لێرەوە دەتوانین بڵێین ژنانی پاشماوەی ئەنفال لەگەڵ خەمە قورس و سەختەکەی خۆیاندا بەپۆشینی ئەو ڕەنگە ڕەش و نیلی و تۆخانەی کە نیشانە و ڕەنگی خەمن پۆشینیان جگە لە کاریگەریی خراپ هیچ کاریگەرییەکی باشی نییە و لەبری ئەوەی هاوکاریی خۆیان بکەن بۆ سووککردنی باری خەمیان، لەسەرووی خەمی ئەنفالەوە خەمێکی تریان بۆ خۆیان و ئەوانەی لەگەڵیاندا دەژین سەربار کردووە، ئەو ڕەنگانەش تەنیا ڕابردوویەکی کولتووری هەیە، ئەویش ئەو نەریتە دواکەوتووەیە کە هەتا ئێستا لەناو کورددا باوە، ئەوەی کەسێکی لە دەست دا لەناو خێزانەکەیدا ئیتر دەبێت ژنانی ناو ئەو خێزانە ڕەش بپۆشن، دیارە ئەو کولتوورە تەنیا بۆ ژنە نەک پیاو وەکو ئەوەی تەنیا ژن خاوەنی کارەساتەکان و دەرد و

مەینەتییەکان بن، کە لە کارکردندا ئەو تەنیا بۆی هەیە کار بکات و ئەرک بەجێ بهێنێت نەک داوای ماف، لە شادییەکاندا خۆی داپۆشێ و تێکەڵاوی نامۆ نەبێت، لە خەمەکانیشدا ئەو قەرەبوو بدات، گوایە پیاویش خەم لە مردوویەک ناخوات؟ بۆچی دەبێت لەو کارەساتانەدا ژن خاوەندارێتی وەرگرن، بەڵام لە مافدا کۆیلەیەتی، واتە تەنیا ئەرکیان هەبێت نەک مافیش بەرامبەر ئەرک، ئەو ڕەشپۆشینەش کولتووری کورد نییە، بگرە کولتووری عەرەبە کە جگە لە ڕەشپۆشین عەبا و پەچە و حیجابی ڕەشیشیان داهێنا بۆ ژن وەکو کۆت و بەندێکی کاریگەر و خراپ لەسەر هەست و دەروونی ژن، دیارە عەرەبیش لە باوەڕە ئاینییە دواکەوتووەکانەوە وەریان گرتووە، کە هەندێکیان تەنیا دەم و دەم وەرگیراوە نەک لە ڕێگەی قورئانەوە، چونکە تەنانەت بۆ ئەو ژنانەش کە موسڵمانن بەپێی بۆچوونە ئاینییەکان ڕەشپۆشین گوناهێکی گەورەیە، بەڵام پێ دەچێت تەنانەت ئاینیش بۆ مافی ژن تەنیا لە ماف لێ سەندنەوەدا حسابی بۆ بکرێت، بۆ ئەو لایەنانەی تر کە لە بەرژەوەندی دەروون و ژیانی ژندایە ئاینیش پشتگوێ بخرێت، دەنا ئەو کۆمەڵەی باوەڕی بەوەیە ژن لە ژێر بەرگی ڕەشدا بچەوسێنێتەوە... هەرگیز موسڵمان نییە، لە کاتێکدا بۆ بیانووەکانی تر هەمیشە ئیسلامیان کردووە بەچەکوشێکی ئامادە بۆ سەری خەڵک. لەلایەکی تریشەوە عەرەبە توندڕەوەکان ڕەش دەپۆشن گوایە سەرنجی پیاو ڕاناکێشێت بەلای خۆیاندا، بەو شێوەیە تووشی گوناه نابن کە ئەوەش دووفاقی بەبۆچوونە سەرەکییەکە دەبەخشێت، ئیتر ئەو کولتوورە لای نەتەوەکانی تر باو نییە و زۆر لە کولتوورەکان لە چەند ڕۆژی سەرەتادا پۆشاکی سپی دەپۆشن کە پێم وایە ئەوەیان پەسندترە بۆ ڕەشپۆشی مردن و دەکرێ سپی نیشانەی ڕۆح ببەخشێت، هەندێکیش تەنیا هەفتەی یەکەم ڕەش دەپۆشن و ئیتر لای دەبەن، تەنانەت لای هەندێ لەوانەی مەزهەبی شیعەیان هەیە تەنیا چل ڕۆژ ڕەش دەپۆشن و پاشان بەگوناهی دەزانن، بەڵام ژنی کورد بەشی شێر و نرخی شێری داوە بەم کولتوورە نەشیاو و



بێگانەیە ...ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژنی کورد لە هەموو ژنێک زیاتر خۆی بەدەستی خەم و نەریتە دەماودەمییەکانەوە داوە.

## ڕەشپۆشی هێمای قەلەڕەشە

بەبۆچوونی من ڕەشپۆشی هێمایەکی زۆر کۆن و لە مێژینەی هەیە و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکی خەلیقە و پاش دروستبوونی مرۆڤ، چیرۆکی یەکەم کوشتن لەنێوان قابیل و هابیلدا، بەپێی ئەو چیرۆکە کە بۆ یەکەم جار (قەلەڕەش) گۆڕی هەڵکەندووە، هەر لەبەرئەوەشە ئەو جۆرە باڵندەیە بەشووم ناسراوە و زۆرجار لە ناو کورددا، گوێت لێ دەبێ، کاتێک دەنگی قەلەڕەش لە شوێنێک هاتووتە بەرگوێیان بەسەر هەرێمێک، شوێنێک، ماڵێکدا گەڕاوە، گوتوویانە بەڵایەک ڕوو لەو شوێنە دەکات و تفیان بەڕووی باڵندەکەدا کردووە، کەواتە دەکرێت ڕەنگی ڕەش لە سیمای ئەو قەلەڕەشەوە وەرگیرا بێت بۆ مردن کە نیشانەی بەڵا و نەگبەتییە.

بەڵام خۆ قەلەڕەش نیشانەی بەڵایە و تفی بەڕوودا دەکرێت، بۆ دەبێ ژنیش ببرێتە ئاستی قەلەڕەش؟! ئایە ژن هۆی کەوتنەوەی ئەو بەڵایەیە کە ڕۆڵی قەلەڕەش ببینێت بۆ چەندین ساڵ هێماکەی بپۆشێ؟ ئایە ئەو ماڵە بۆیە تووشی بەڵا و کەس لێ مردن بوون چونکە ژنی تێدایە؟ ئایە ئەگەر قەلەڕەش شایانی تف لێ کردن بێت و دوعا بکرێت جارێکی تر نەگەڕێتەوە بۆ هەرێم و ناوچە و سەر ماڵ و خاکیان بۆ دەبێ ژن کە واتای بەرهەم و بوون و ژیان دەبەخشێت ئەو هێمایەک لەو باڵندە نەفرەت لێ کراوە وەرگیرابێت و هەمیشە بهێننەوە نەک سەر خاک و هەرێمی خۆی بگرە ناو ماڵ و خێزان و ژیان و دەروونی خۆی؟

دوایی پێویستە ژن لە خۆی بپرسێت ئایە ئەو ڕەنگە نیشانەی خەمن لە کولتووری کوردیدا و لەڕووی زانستییەوە کاریگەری دەروونی خراپی هەیە کێشەکانیان چارەسەر دەکات یان قورستری دەکات؟ نەک هەر ڕەنگی ڕەش بگرە تەنیا پۆشینی یەک پۆشاک بۆ ماوەیەکی زۆر وەکو ڕۆتین مرۆڤ

تووشی بێزاری و خەم دەکات و هەستکردن بەتازە نەبوونەوە و گۆڕانکاری لە ژیاندا دەبەخشێت، لەلایەکی تر مرۆڤی خەمبار ئەگەر بۆ ساتێکیش خەمەکەی بەڕوێتەوە ئەو پۆشاکە ڕەشە وەبیردێنێتەوە کە ئەو کەسێکی خەمبارە و هێمای خەمباریی بەبالای بڕیوە نابێت شاد ببینرێت، نەوەک کۆمەڵگای دواکەوتوو تانەی ئەوەی لێ بدەن کە مردووەکەی بیرچووەتەوە چونکە ئەوی ژن پێویستە لایەنی کەم سالێک بچێتە ژێر بەرگی ڕەش و ئازاییەتباری و بەشداریی هیچ بەختەوەرییەک نەکات، تەنانەت بەپێکەنینیش زۆرە، ئەمەشیان پەیامێکە بۆ خۆی نەوەک لە ساتێکدا بیری بچێت کە کەسێکی خەمبارە، لەلایەکی تر پەیامێکە بۆ بەرامبەر کە ئەو کەسێکی خەمبارە و ئەو ڕەشەش ئالای خەمبارییەکەیەتی و بەو شێوەیە مامەڵەم لەگەڵ مەکەن سنووری خەمباریم بشکێنن، لە هەندێ ناوچەی گەرمیانیشدا ٧ ساڵ ڕەش دەپۆشن، بۆ ژنانێکیش کە تەمەنیان دەگات بەمامناوەندی لە چل ساڵی بۆ سەرەوە و تووشی کارەساتی مردنی کوڕ و کەسوکار دەبنەوە ئەوا بەهەموو تەمەن ڕەنگە زیندووەکان قەدەغە دەکات لە خۆی ڕەنگە مردووەکان دەپۆشێت.

### غەم و ئازادی تاک

ولیەم جیمس کە بەفەیلەسوفی ئازادی و ئازادیی ئیرادەی مرۆڤ ناسراوە، هەروەها بەفەیلەسوفی بیری نوێی ئەمەریکاش ناودەبرێت، وشەی ئازادیی تاک واتایەکی تایبەت و زەنگێکی بالا لە زمانی جیمس لێ دەدات، باوەڕی وایە لەژێر خۆردا هەمیشە نوێ هەیە، جیمس دەڵێ (ئەو مرۆڤەی خۆی بەبەندەکانەوە دەبەستێتەوە لە یاساکانی فیکر و کۆمەڵگا و ئەو مرۆڤەی کە خاوەنی چالاکی و بەرهەمی زۆرە خۆی یاسایی خودی خۆیەتی)، چوون لای ئەو ئازادی (تاک کە کۆنترۆڵی بەرژەوەندی Voli-tionواتە ئیرادە)ی خۆد دەکات.

چونکە مرۆڤ هەموو یەکسانە و جیاوازی لە نێوان ئەم و ئەودا نییە



بەکاری سەرکەوتوو و سوودبەخش نەبێت. ئیرادە و عەقڵ کە تەواوکەری یەکترن بەهەردووکیان دیاریکەری ئازادیی تاکن، پێوەندییەک نییە لەنێوان خودی خۆمان و مەسەلەیەک لە دەرەوەی عەقڵ، پێوەندییەکە لەنێوان خودی خۆمان و حاڵەتەکانی عەقڵدا.

بۆیە کاتێک مرۆڤ خەمبار دەبێت ئیرادەشی لاواز دەبێت، ئیرادەی لاوازیش واتە نەتوانینی حوکمکردن و ئیرادەکردنی خود، هاوسەنگ نەکردنی حاڵەتەکانی عەقڵ، ئەو مرۆڤەش نەتوانێت ئیدارەی خودی خۆی بکات دەبێت بەمرۆڤێکی کۆیلە، نەک ئازاد، بۆ هەموو هەنگاوێک پێویستی بەهاندەر و ڕێنماییکەر دەبێت، ژنانی پاشماوەی ئەنفالیش چەند جارێک ئازادییان زەوت کراوە، جارێک وەکو ئەوەی ژنن و سروشتیان زیاتر ئازاریان دەدات، جارێک ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان ژیانیانی زەوت کردووە، جارێک خەم و چاوەڕوانی بێهودە و دواجاریش شۆکبوون بەوەرگرتنەوەی ئێسقان لەبری ئەو ئومێدەی چەند ساڵە چاوەڕوانی دەکەن، لەوانەش زیاتر ئەو بارودۆخە داسەپاوەی کە بەبێ خواستی و ئیرادەی خۆیان سەپێنراوە بەسەریاندا و تێیدا ماونەتەوە.

هەموانیش لەسەر ئەوە کۆکین کە مرۆڤی خەمبار، مرۆڤی خاوەن ئیرادەی لاواز، مرۆڤێکە کە بەڕێوەبردنی خودی لە دەسەڵاتی خۆی برابێتە دەرەوە بۆ دەسەڵاتی تاکەکانی عەشیرەتەکەی و خێزان و تەنانەت دەسەڵاتی کوڕە بچووکە هەرزەکەی، ناتوانێت پەروەردکارێکی ڕاست و دروست بێت و ئەو نەوەی ئەو پەروەردەی دەکات ئازادیی تاک و ئازادیی تێدا بەرجەستە ببێت، بگرە مرۆڤی ملدەر بەکۆیلایەتی پەروەردە دەکات، بەتایبەت کە لەسەر مەسەلە کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییە داسەپاوەکانی بەسەر پاشماوەی ئەنفالدا سەپاوە، پراکتیزەی توندوتیژی بۆ خۆی واتە هەوڵدان بۆ ڕامکردن و زەوتکردنی ئیرادەی، بۆیە ئەو مرۆڤانەی کە ڕووبەرووی توندوتیژیی قورس دەبنەوە ئەگەر بەبایەخەوە مامەڵەیان لەگەڵدا نەکرێت لە دواڕۆژدا مەترسی لەسەر بەرژەوەندییە خودییەکانی خۆیان و کۆمەڵ دروست دەکات.

## فیمینست و خەمی ئەنفال

پێشتر لە بەشەکانی تردا باسم کردووە کە فیمینزم واتە زانستی ژنناسی، زانستی ژنناسیش واتە لێکدانەوەی کێشەکان و مەسەلەکان و مافەکانی ژن لە چوارچێوەیەکی زانستییانە و مرۆڤانە و مۆدێرنانە، بۆ هەر دۆخێک ژنی پێدا تێپەڕدەبێت، ئەو هەولانەش لەلایەن ژنەوە دەدرێت لە باشووری کوردستان کردەیەکی دووفاقییە و بێلایانانە نییە، هاوکاریکردن و کاربۆکردنیش بۆ نیوەی کۆمەڵێک، لەناو کورددا لە نیوەکەش زیاترە، دووچاری کاریگەرییەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و دەروونییەکانی ئەنفال بوویێت بەبیروبۆچونێکی بەرژەوەندی خواستانە ناکرێت وەکو گرووپی ژێر ڕکێفکەوتووی حزبەکان و حزبەکانیش لە بنەمادا هێندەی بەرژەوەندیی خۆیان و هێندەی پەردە لەسەر دەستە ڕەشەکانی پشت پەردەش هەڵنەماڵدرێت مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، بۆیە ژنانی پاشماوەی ئەنفال پێویستییان بەبۆچوونێکی ژنانە و مرۆڤانەی جیاواز هەیە بۆ ڕزگاربوون لەو دۆخە چەقبەستووە، کە بەباوەڕی من فیکری فیمینزم باشترین دەرفەتە بۆ ڕزگارکردنی ژنان لەو بارودۆخە، هەروەها هەڵبژاردنی فیکری فیمینزم لەناو کورددا پێویستە بەرنامەڕێژییەکی نوێ و گونجاوی هەبێت، کۆمەڵی ئێمە پێویستی بەفیمینزمی ئەورووپی نییە و لەگەڵ کێشە و خواستەکانماندا ناگونجێت، هەروەها پێویستی بەجۆرێ فیمینزمی عەرەبیش نییە، کۆمەڵی کورد کۆمەڵێکی پەرشوبلاو و فرەخاوەن و بێ دڵسۆزە، پێویستی بەپرۆگرامێک هەیە زیاتر مرۆڤانە بێت بۆ کۆکردنەوەی ئەو پارچە ترازاوانە، ژنی کورد پێویستی بەعەقڵی فیمینزم هەیە بۆ ئەوەی لەو ونبوون و پارچەبوونەوە بیانگوێزێتەوە بۆ گیانێکی یەکگرتوو کە بەتەنگ کێشەکانی یەکەوە بڕۆن، لایەنی کەم ئاوڕێکی لە ژنانی دەرەوەی ئەو کارخانە لەباربەرە بداتەوە کە خەمی ژنانی پاشماوەی ئەنفالی تێدا دەکرێت بەکارتی بەرژەوەندی.



## تەنیا ژنان دەتوانن فیمینزم بن لە مەسەلەی ئەنفالدا؟!(١)

ئەم پرسیارە مافی هەر مرۆڤێکە لە خۆی بکات، ئایە خەمی پاشماوەی ئەنفال تەنیا خەمی ژنانە، یان سیاسییەکانە، یان هونەرمەندەکان و دەوڵەمەندەکان و... تاد؟، یان فیمینزم شتێکی جیاوازە و دەکرێ خەمی ئەنفال لە کۆڵ گرێت؟ کە بەبۆچوونی من هەموو گرووپەکانی ناو کۆمەڵ بەرپرسن لە خەمی ئەنفال و هەمووشیان لەناو بۆچوونی فیمینستیدا جێگایان دەبێتەوە ئەگەر بتوانرێت بەدروستی دابڕێژرێت، ئێمە پێشتر گوتمان کورد پێویستی بەبۆچوونێکی فیمینزمیانەی جیاواز هەیە لەوەی لە ئەمریکا و ئەورووپا و لای عەرەب هەیە، چونکە ئەو بیرە ژن لە بۆچوونی هەڕەمەکییانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ بۆچوونی زانستییانە، بۆیە کارێکی ئاساییە هەندێ پیاوی یەکسانیخواز و پسپۆر لەناو گرووپی فیمینزمیدا هەبێت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ژنانی ئەنفال، بەتایبەت لەبوارەکانی زانستی دەروونناسی و کۆمەڵناسی و زانستی سیاسی و ئابووری، ئەویش لەبەرئەوەی کۆمەڵی ئێمە زیاتر کۆمەڵێکی نەخوێندەوارە و کەم ژن هەیە دەستیان دابێتە پێنووس و لێکۆڵینەوە و هەبوونی ژن لەو بوارانەدا لە پەنجەی دەستێک تێناپەڕێت و ئەو ژنانەش کە دەستیان بۆ قەڵەم بردووە زیاتریان دەستیان بۆ قەڵەمی سۆزداری و کێشەیەک بردووە کە زیاتر بەشیعر و چیرۆک بتوانرێت دەرببڕێت نەک بواری فیکر و زانستی، لەلایەکی ترەوە ناکرێت فیمینزم تێکۆشان بێت بۆ زاڵکردنی هیچ بەرە و ڕەگەزێک بەرامبەر ئەوی تر، پێویستە فیکرێکی یەکسانیخوازانە پشت بەکارەکان بگرێت، بۆیە ئەوانیش دەتوانن لێکۆڵینەوەی ئەو بۆچوونانەی لە بەرژەوەندیی کێشەی ژن بەگشتی و ژنانی پاشماوەی ئەنفالە بەتایبەتی بخەنە خزمەتی ئەو چینە بێ بایەخکراوەوە و ئەو پیاوانەش دەتوانن فیمینستی بن. واتە پیاوەکە ببێت بەفیمینیست نەک فیمینست بچێتە خزمەتی عەقڵێکی نافیمینستانە.

چونکە لە بنەمادا گرووپی فیمینستی واتە هەبوونی گرووپێک پسپۆری

له هەموو بوارەکاندا هەبێت، کۆمەڵی خەڵکی یەکسانیخواز و زانستخواز و مافخواز کە ئامانجیان گۆڕانی شتە ناشیرینەکان بۆ جوان، هەڵەکان بۆ ڕاست، سازشەکان بۆ بەرگری، تەسلیمبوونەکان بۆ یاخیبوون، زیندووکردنەوە و هەژانی ویژدان بەرامبەر ناچیزەکانی جیهانی کوردی، بیر لە هەژار و قوربانی و پەراوێزخراوەکانی ناو کۆمەڵگەکەمان بکاتەوە نەک ئەوانەی هەژار و لێقەوماوی گەیاندوە بە هەژاری و لێقەومان، کۆمەڵێک عەقڵ خودیان بەڕێوەبەرێت و بێ لایەنانە خوێندنەوە بۆ کێشەکان بکەن، نەک بە سۆزی لایەنگیری.

فیمینزمی کوردی پێویستە لەسەر ئەو بنەما دابمەزرێت هەموو باوەڕی بەوە هەبێت ئەوانەی دەوروبەری پێویستی بە قوربانی ئەو هەیە، چونکە ئەوی فیمینیزم کەسێکی زانستخوازە و تێ دەگات ئەو کۆمەڵە و ئەو گرووپەی وەکو ژنانی پاشماوەی ئەنفال لە کارەساتەکان گەڕاونەتەوە لەڕووی سایکۆلۆجییەوە پێویستی بە چ جۆرە مامەڵەیەک هەیە، چونکە ئەوی فیمینیزم دەزانێت ئەویتری کۆمەڵ چەند بە هۆی یاسا نادروستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان چەوساوەتەوە و دەزانێت چۆن ڕاڤەی دروستی هەبێت بۆی بەرەو ڕاستکردنەوە، بەو شێوەیە هەمووان بەرپرسیار بین بەرامبەر ئەوانی تر، بەو شێوەیە دەتوانین ئەو کۆمەڵەی دڕندەکان کردیان بە کۆمەڵی گوناه و ڕک گۆڕینەوە بیکەین بەکۆمەڵی خۆشەویستی گۆڕینەوە، بەو شێوەیە وەکو کارامازۆف ڕوونی کردووەتەوە کۆمەڵەکان دەبێت بە کۆمەڵی سەرکەوتوو، ئەرک و لێپرسراویەتی و قوربانیەکانیش دابەش دەبێت بەسەر ئەوانی تردا.

ئەمەش سیڤلێک نییە لەسەروو توانای مرۆڤەوە بێت، چونکە بایەخدان بە بەهاکانی دنیا بەرەو جیهانێکی مرۆیی تر و لە دایکبوونی بارودۆخێکی سیڤیلی دیاریکراو نییە کە تەنیا هۆشیارییەکی بەرز و پێشکەوتوو بهێنێتە ئاراوە، بگرە بەرێژەیەکی باشیش بایەخدان لە دەروونی مرۆڤدا شتێکی خۆڕسکە و لەگەڵ بیرکردنەوەی جدیی مرۆڤدا فەراهەم دێت.



## دەرەنجام

کولتووری توندوتیژی لەناو عێراقدا لە ساڵی ئەنفالەوە دەستی پێ نەکردووە، مێژووی توندوتیژی لەو وڵاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٨ و ئەو خەسڵەتە بەبێ پرۆگرامی زانستی لە ناخی خەڵکی عێراقدا بەگشتی ناسڕێتەوە بەئاسانی، بەڵام هیچ توندوتیژ و جەختێک ناگات بەپەڕاوێزی توندوتیژی پاشماوەی ئەنفالەکان بینیوێتی، بۆیە پێویستە کۆمەڵی کوردی و ئەو مرۆڤانەی لە خۆیان ڕادەبینن بکەونە خۆیان بۆ داڕشتنی پرۆگرامێک کە کارەکتەری سیاسی تێدا وەدەرنێن و بەتەنیا خەسڵەتی مرۆڤبوون و کۆمەڵایەتیبوون ببێت بەکارەکتەری ئامادە و ڕۆحی مرۆڤەکان بگەیەنێت بەشتێک لە ڕازیبوون، ئەوەش بەپڕۆژەی جدی و کاری بەرهەمهێنەر دێتە ئاکام ژنانی پاشماوەی ئەنفال لە ئێستادا وەکو هەنگاوێکی خێرا پێویستی بەچەند هەنگاوێک هەیە بەفیکرێکی فیمینستییانە جێبەجێ بکرێت لەوانە:

١- ژنانی کورد لەبەرئەوەی ڕێژەیەکی زۆریان نەخوێندەوارن، زیاتر باوەڕیان بەڕەمزە ئاینییەکان هەیە و بەنمرەی دووەم باوەڕی بەپزیشک هەیە بۆیە پێویستە هەمەهەنگییان لەگەڵ پیاوانی ئاینیدا هەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێ لایەنی ئاینی دەربارەی هاوسەرکردنەوە و پۆشاکی ڕەشپۆشین لەناو کۆمەڵی ئەنفالکراودا، بۆ ئەوانەی کە هێشتا گەنجن و هەموو ئەوانەش کە لە ساڵی درێژی چاوەڕوانیدا گوڵی تەمەنیان بەپایز بەخشی چەندێک قەدەر تاوانبارە بەرامبەریان دوو هێندە دەسەڵاتە کوردییەکان و ڕەمزە ئاینییەکانی کورد کە خاوەنی هیچ پرۆژەیەکی هاندەر نەبوون بۆ ئەو مەسەلەیە، لایەنی کەم نەک وەکو مرۆڤ تەنیا وەکو ئەو بوونەوەرەی کە دەبێت بەهۆی زیادبوونی ژمارەی ئەو نەوەیەی نیوەی بەر لە ئەنفال و کیمیای و کوشتوبڕی کەوت و ڕۆیشت.

٢- هەبوونی چەندین جۆرە کاری دەست بۆ ئەو ژنانە و هاندانیان

بۆچوونە ئەو جێگایانە، چونکە سەرقاڵبوون بەو جۆرە کارانەوە یەکێکە لە فاکتەرەکانی ئارامبوونەوەی مرۆڤی خەمبار.

٣- کردنی ڕاپرسێک لەناو ژنانی پاشماوەی ئەنفالدا دەربارەی ئارەزوو و بایەخەکانی کە بۆی نەهاتووەتە دی، لە دەرەوەی گەڕانەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوی، و پاشان بەپێی ڕێژەی وەڵامە لێک نزیکەکان ئەو جۆرە کۆرس و دەورە و کارانە لەناو کۆمەڵگە زۆرەملێییەکانیاندا بەرجەستە بکرێت.

٤- کردنەوەی یانەیەکی وەرزشی و بەچاودێری پزیشکێکی پسپۆڕ وەرزشیان پێ بکرێت، چونکە وەرزش یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە کاریگەریی خەم لەسەر دەماغ و دڵ کەمتر دەکاتەوە.

٥- مانگانە کۆکردنەوەی زانستییانە بەو ژنانە و ڕاڤەکردنی زانستییانە سەرجەم ئەو فاکتەرانەی کە دەبن بەهۆی ئێش و ئازار و ناساغی و چۆن زیاتریشیان لە خەمەوە سەرچاوەی گرتووە.

٦- هەوڵدان بۆ دابینکردنی ئامێرەکانی زەوی کێڵان و تۆ بۆ چاندن و پێویستییەکانی تر، کە ژمارەیەکی زۆریان تەنیا تاقەنەی بەجێماوی پاش ئەنفالن و یەک وزەش بەبێ هاوکاری هیچی بۆ ناکرێ.

٧- هەبوونی هەمەهەنگی لەگەڵ پزیشکە دەروونناسەکان و هەوڵدان بۆ بینین و چارەسەرکردنی هەر ژنێک کە لەناو دەریای خەمی ئەنفالدا خنکاوە.

٨- هاوکاریکردنیان بۆ بنیاتناوە لە دێهاتەکاندا و گەڕانەوەی شتێکی کەم لە ڕابردوو.

٩- دروستکردنی شارێکی تایبەت بەئەنفال بۆ ئەوانەی نایانەوێت بگەڕێنەوە بۆ لادێیەکان و شارێک خزمەتگوزارییەکانی لە سەرجەم شارەکانی تر زیاتر بێت وەکو قەرەبووکردنەوەی ستاتیکای شوێن لە هزری پاشماوەی ئەنفالدا و دەرهێنانیان لەو کۆمەڵگایانەدا کە تووشی جۆرەها گرێی کردوون و وەکو زیندانی سەیری ئەو شوێنانەیان کردووە.



١٠- هەوڵدان بۆ باسکردنی ئەو باسانەی دەربارەیان نووسراوە و نووسینیش لەسەر ئەنفال بەزمانێکی ساکارتر بۆ ئەوەی بەشە خوێندەوارەکەی تێ بگات.

١١- هەوڵدان بۆ باشکردنی باری ئابوورییان و وەدەستخستنی ئەو ئابوورییەی کە لایەنەکان بەناوی ئەنفالەوە وەری دەگرن بۆ دەستی ڕێکخراوێک یان گرووپێک کە ئەو کارانە ئەنجام بدەن و سوودەکانی بۆ ئەنفال بگەڕێننەوە نەک بۆ دەسەڵات و بۆ بەرژەوەندیی کەسانیی دەرەوەی بازنەی پاشماوەکانی ئەنفال.

١٢- هەوڵدان بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو کەسوکاری ئەنفالدا.

١٣- کردنەوەی مۆزەخانە و بنکە سەبارەت بەئەنفال لە هەموو شارەکانی کوردستاندا.

١٤- زیادکردنی بابەتی ئەنفال بۆ سەر میتۆدی خوێندن.

١٥- کردنەوەی دەزگایەکی گەورەی لێکۆڵینەوە، کە لە زۆربەی ئەو شوێنانەی کوردی تێدا دەژی لقی هەبێت بەدواداچوون و لێکۆڵینە و چالاکی سەبارەت بەمەسەلەی ئەنفال.

ئەمانە و چەندین هەنگاوی تر پێویستیی هەنووکەیین بەرامبەر بەپاشماوەکانی ئەنفال، بۆ گەڕانەوەی شتێکی کەم لەوەی هەیانبوو و هەروەها بەهێزکردنی ئیرادە و لاواز نەکردنی هەستی نەتەوایەتی و پەشیمانبوونەوە بەو هەموو بێ بایەخییەی بەرامبەر ئەنفال دەنوێنرێت، بەو هەنگاوە سەرەتاییانەی بەشێکی باش لە خەمەکانی پاشماوەی ئەنفالەکان سووک دەکەن و بەو کارەش نەوەیەکی ئێستا گەنجی ناو ئەو کۆمەڵە بەرەو ئیرادەیەکی دروستتر دەبەن کە لەناو ئەو ماڵە پڕ لە خەمانەدا پەروەردە بوون، بێ بایەخی دەسەڵاتە کوردییەکان بەو لایەنانەی کە سەروەریی ئەنفالیان بۆ بگەڕێنێتەوە کە هەستی نامۆبوونی ئەنفال بەنەتەوەی کوردی لا دروست کردوون. خۆ ئەگەر هەوڵ نەدرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و

خەم و پەژارە و ناتەواوییەکانی پاشماوەی ئەنفالەکان، ئەوا ئێمە کۆمەڵی خۆمان دابەش دەکەین بەسەر دوو کۆمەڵدا، یەکێکی ئەنفال کە خاوەنی کارەساتی و خەمی گەورەیە و لە ژیانی سیڤیلی دوورە و ئەوی تری دەرەوەی ئەنفال کە خۆی ڕێژەیەکی زۆری خەونەکانی خۆی بەرهەم دەهێنێت و لە هەموو هەنگاوێکدا پێویستی بەکۆمەک و هاوکاری نییە، ئەویش واتای دروستبوونی دوو جۆرە کۆمەڵ دەکات لەناو پارچەیەک لە گیانی نەتەوەیەکی پارچە پارچە کراودا، ئەو دوو کۆمەڵەش یەکێکیان نەوی و ئەوی تریان باڵایە لە کاتێکدا پێویستە بایەخدان بەئەنفالەکان هێندە باڵا بکرێت بەئەنفالکراوەکانی خۆیانەوە بکەن، نەتەوەی کوردیش هێندەیان شانازی پێوە بکات و بیانگەینێت بەئاستێک کە ببن بەسیمبۆلی کۆمەڵی کوردی. بەو شێوەیە شتێک لە خەمەکانیان بڕەوێنینەوە. ئەو بەشەی کە تایبەت بێت بەخەمی ژنانی ئەنفال بەئەرکی بزووتنەوەیەکی فیمینستی دەزانم کە هێشتا لەناو کوردا سەری هەڵنەداوە.

**تێبینی**

لەم نووسینەدا سوود لە زانستی دەروونی و پزیشکی و فیزیکی ئەوەندە وەرگیراوە کە مەبەستەکەم بگەیەنم و زۆر لایەن و بۆچوون پزیشکی و دەروونناسی و فیزیکی و بابەتی ورووژاندن لەگەڵ باسکردنی هەر تەوەرێک لەوانەی من باسم کردوون، بەڵام ئەوە بەجێ دەهێڵم بۆ پسپۆڕانی ئەو بوارە و ئەوان دەتوانن دروستتر دەربارەی بدوێن، کە خوازیارم بەوردی لێکۆڵینەوەی خۆیان لەو بارەیەوە هەبێت بۆ پاشماوەکانی ئەنفال.

١- لێرەدا کە دەڵێم پیاویش دەتوانێت فیمینستی بێت، مەبەستم ئەوەیە کە ئەنفال کارەساتێکە لەسەرروو هەموو سنوورەکانەوە، بۆ خەمی ئەنفال هیچ هێڵێک پێوەندیی ئەنفال و هەموو چین و توێژ و ئایدیۆلۆجییەکان نابەزێنێت، سەرجەمیان پێویستە بچنە خزمەتی ئەنفالەوە. دەنا لە بنەمادا فیمینزم تەنیا جیهانبینی ژنانە دەگرێتەوە.



**ئەم سەرچاوانە سوودی لێ بینراوە:**

- كيف تواجه التوتر العصبي؟... د.أ. عبدالوهاب السيد سالم.
- الحرية و تجسيد الوهم.. وليم جيمس.
- البرت انشتين والنصرية النسبية.

## پردی نێوان من و تۆ

– ناو یان ناوی خوازراو؟

– ڕەگەز.

– بارودۆخی کۆمەڵایەتی؟

– ئاستی خوێندن؟

– پیشە؟

– تێبینی و سەرنجەکانت؟

– کام بەشیانت لە بەشەکانی تر پێ باشتر بوو؟

– کام بابەت زیاتر بەپێویست دەزانیت بۆ هاوکاریکردنی بارودۆخی ژنی کورد؟

– چ بابەتێک زیاتر بەپێویست دەزانیت بۆ وروژاندن و ڕاڤەکردن کە ئێمە لەم کتێبەدا باسمان نەکردووە؟

– تا چەند پێت وایە کێشەی ژنان- ئافرەتانی کورد بەبزووتنەوەیەکی فیمینستی بەرەو پێشەوە دەچێت؟

– دەخوازێت لە ڕێگەی بزووتنەوەیەکی فیمینستییەوە چی بکرێت؟

– بەراوردی تۆ لەنێوان ڕێکخراوەکانی ژنان- ئافرەتان و بزووتنەوەی فیمینستیدا چییە؟

دەتوانێت بەتێبینی و سەرنجەکانت لە ڕێگەی ئەم ئیمەیلەوە بگەیەنێت.

kazewas@hotmail.com

www.kaziwasalih.com



## پێڕست